# یادی کەلار

بڵاوکراوەیەکی تایبەتە بە ساڵیادی بە قەزابوونی کەلار

ژمارە (٢) ٢٠١٨/٢/٢٨

**سەرپەرشتیاری بڵاوکراوە:**

مستەفا سەعید عەلی

ئەحمەد محەمەد قادر

دیزاینی بەرگ و تێکست : لاوان ئەحمەد

## لەم ژمارەیەدا :



| ز | بابەت | نووسەر |
|---|---|---|
| ١ | جێگەی شاری کەلار وسەرەتایی ئاوەدان بوونی لە ئایاری ١٩٥٤ | عبدالرقیب یوسف |
| ٢ | رادیۆیی دەنگی گەرمیان ... | ئەحمەد محەمەد قادر |
| ٣ | مێژووی شوێنەوارەکانی کەلار و دەوروبەری | محەمەد عەلی کەریم ـ |
| ٤ | پێکهاتەی زمان لە کەلاردا | پ.ی.د. دارا حەمید محەمەد |
| ٥ | مێژووی گەڕەکی سەرکەوتن | مستەفا سەعید عەلی |
| ٦ | کەلار پێشەنگە! | ئیبراهم باجەلان |
| ٧ | کەلاری باشوری کوردستان و کەلار دەشتی ئێران لە بەراوردێکدا ! | بورهان محمد فرج |
| ٨ | چەن مەلۆیەك لە خەرمانی بیرەوەریەکانم | هیدایەت ئەحمەد کریم |
| ٩ | شاعیر و کەسە دیارییەکانی دەشتی شێروانە | ساڵح هەلاج |
| ١٠ | دەربارەی کشتوکاڵ لە قەزای کەلار و دەورووبەری | رەحیم حەمید عبدولکریم |
| ١١ | مانگرتووان فۆرمێکی تری خەباتی مەدەنی لە کەلار | باوکی ژیوار |
| ١٢ | هۆرە | عەبدوڵلا حەسەن قادر |
| ١٣ | "بارین " یەکەم رۆژنامەی ژنانەی ئەهلی لە کەلار وگەرمیان | سوعاد حاتەم |
| ١٤ | مێژووی تیپی شێروانە | خۆسرەو جاف |
| ١٥ | هۆکارەکانی دروست بون و فراوانبونی شاری کەلار | مشیرعارف علی |
| ١٦ | دادگای کەلار | گۆران حسێن ئەحمەد |
| ١٧ | جەلال بیلال یەکەم قائیمقامی کەلار | سەباح عەلی جاف |
| ١٨ | شێروانەو تیلەکۆ مێژووی کارگێرییان سرایەوە | رزگار حاجی حەمید |
| ١٩ | چالاکییەکانی فێستیڤاڵی ٤٧ هەمین ساڵیادی بەقەزابوونی کەلار | دلێر عەبدولرەحمان |
| ٢٠ | وێنە مێژووییەکانی کەلار | دیار رەشید |
| ٢١ | بیرۆکەی یادی بەقەزابوونی کەلار | شەهاب حاجی ئەحمەد |



**ناونیشان : کوردستان – گەرمیان – کەلار – قایمقامیەتی قەزای کەلار**

# جێگەی شاری كەلار وسەرەتایی ئاوەدان بوونی لە ئایاری ١٩٥٤

• عبدالرقیب یوسف:

شوێنی شاری ئێستای كەلار دەكەوێتە ناوچەیەكی شارستانی كۆن كە چەن گردێكی شوێنەواری لە دەشتەكەیدا واتە لە( دەشتی شێروانە) دا هەیە لەوانە گردی قەڵای شێروانە و گردەگۆزینە و (تەپەرەحیم) كە مێژووی تەپە رەحیم دەگاتە كاتی حەلەف واتە (٥٠٠٠ـ٤٥٠٠) پێش زاین [١] و یەغنی گرد لە سەید خەلیل كەكاتەكەی كاتی سومەر و ئەكەدە و هەروەها جۆگەی گاوری. شوێنی كەلار دەكەوێتە سەر ڕێگای كۆنی كاتی ئەشكانی و ساسانی لە نێوان ( تەیسەفون ) ی پایتەختیان كەپێی دەووترێت (سەلمان پاك) لەتەنیشتی بەغدا و ئەزەربیجان. ڕێگا هاتووە(خالص) و دەلی عباس و قەرەپە و دەشتی كەلار و چوە بۆ سەیدخلیل و ملەی سڵاوگە ـ ژاڵەی سەفەر ـ كیژۆك ـ گەرمك ـ بنە بەراز ـ بەلەگاوی ـ زاوت ـ گۆڕی ئەسپ ـ چەرچەقەڵا ـ بت خالە ـ كەڵی پەیكوڵی و شاخی سۆڵە و ڕەزایەن و سەی دسادق و ناڵپارێز و قزلجە و بانە و سەقز [٢]

دەشتی كەلار( دەشتی شێروانە ) لە ڕۆژهەڵاتەوە تا شاخی گومار (١٩ـ٢٠كم) ە لە سەدەی هەڤدەیەمدا ناوچەی كەلار بەشێك بوە لە سەنجاغی زەنگاباد یانی قەزای زەنگاباد كەلە بەهاری (١٦٥٥) ئەولیاچەلەبی هاتووە (سنجاغ زنك ئاباد )[٣] و نووسیویەتی هەزار سەربازی هەیە و دووناحیەی هەیە كە ناحیەی (قزلرەبات ) و ناحیەی (بەیات)ە نوسیوە ناحیەی بەیات لە باشورێتی . كەدەبێتە (قەرەتەپە) بەڵام باسی (بەیات) بەهەڵە كەووتوە پاش باسی بەعقوبە كەوا تێیە زانین بەیات لە نێوان بە عقوبە و بەغدایە.سیاحەت نامە ب ٤ل ٣٩٠ بەتوركی عوسمانی چاپی ١٣١٤ لە (رحلە ریچ) ل ٢٩٧ ریچ كەهاتووەتە زەنگاباد نوسیویەتی پتر لە نیوەی وێران بووە سلێمان پاشای باپیری عبدلرحمان پاشا بابان مزگەوت و حەمامێك تێیدا درووست كردووە و بە یەك میل دووره لە ڕووباری دیالی (سیروان) واتە( لەرۆژئاوای ڕووبار بوە) و مەڵبەندی هەرێمەكە بوە و (قڵان تپەسی) یانی تەپەی كەلانی ئێستا بەچەند سەد یاردێك لەباكوریەتی و گوندی مەنایتو ( مەینەت ئاوا) بە دوو میل لە ڕۆژئاوایەتی و لە (زەنكەباد) چوین بۆ كۆشكی زەنگی و دوازدە ئیمام و چوین كفری... ریچ ساڵی ١٨٢٠ هاتوە زەنكاباد.

لەیەكی شوباتی ٢٠١٨ دا بە موبایل دیدارێكم تۆمار كرد لەگەڵا بەرێز سهیل خورشید لە كفری كە كتێبێكی بەنرخ لە مێژووی كۆندا داناوە و لەبەر ئەوەی فەرمانبەری دائیرەی گشت وەكاڵە شارەزای نلوچەی كفریی لێیم پرسی شوێن شارۆچكەی زەنكاباد لە كوێیە ووتی من لێ گەڕاوم و بە پێی بۆچونم گردێكی پانەو شەست (٦٠) دۆنمە و چوار پێنج مەتر بەرزە ـ ئەوە شوێنەكەی بەپێی وەسفی ریچ و دەكەوێتە باشوری كولەجۆ بەدەوری (٢كم) و بە پێنج كیلۆمەترێك لەباكوری (شێخ باوە) یە بەڵام ناوی زەنگاباد لەسەر ئەو گردە نییە بەڵكوپێ ی دەڵێن گردە دێم.

هەروەها ووتی عباس العزاوی لە (العراق بین احلالین) دا نوسیویەتی ئەحمەد پاشا بابان وێرانی كردووە و هۆیەكەشی نوسیوە.

ئێستا ناحیەی زەنكاباد كەمەڵبەندەكەی كوڵەجۆ و(١٨،٥كم) لەناوەندی كەلارەوە دوورە كە پێی دەڵێن (ناحیەیی كۆكس)و نزیكی چل دێیە.

نازانم كەلار و دەوروبەرەكەی لەسەدەی هەڤدەهەمدا هەربەشێك بووە لە ناحیەیی زەنكاباد نەك تەنیا لە بواری ئیدارەیەوە یا نا؟ كە ئێستا لێ حساب ناكرێت. ئەگەر ئەو كاتە بەشێك بوبێت دەبێ پاشتر ناوەڕۆكی مێژوو جوگرافی بچووك بوبێت وەك چۆن لە كۆنا شارەزور هەرێمێكی گەورەبوە تاباكوری زێی بچووك بەڵام ئێستا تەنیا بۆ دەشتێ ناوەكەی ماوە. ئەم زەنگابادە جیایە لەگەڵ زەنگابادی مەندەلی كەریچ ناوی هێناوە كە ئێستا پێی دەڵێن (زەنگەوان) لە پشتكو ە و لە ژێر دەستی سلێمان پاشا بابان دابو لەگەڵ بەدرە وجصان. هەروەها نازانین كفریش بەشێك بوە لە زەنكاباد یا نا ئەگەر چەند بواری ئیدارەیەوە بەشێكی ئەو بوە. لە نەخشەیەكی دەوڵەتی عوسمانی ساڵی (١٩١٧) لەسەر شوێنی كفری نوسراوە (صلاحیە، زنج أباد، كفری) واتە كفری بەناوی صلاحیە و زنگاباد هەردوانیش نوسراوە لەگەڵ ناوی خۆشی كەڕەنگە هەركفری مەڵبەندی سنجاغەكەی بوبێت لە ئەوەڵا ڕۆژەوە یان پاشماوەیەك .(٤) ـ شایەنی باسە لە پێش سەدەی نۆیەمی زاینی ناوچەی كفری بەناوی (كوایا)وە لە كتێبی سوریانی (توما) قەشەی ناوچەی ئاكرێ (كتاب الرؤساو ) [٤] توما نوسیویەتی سەرۆكی كەنیسەی ڕۆژهەڵات (گیورگیس) لەسەدەی حەفتەمدا خەڵكی (كفرا) بویە لەناوچەی (كوانا) كەنازانم ئێستا ناوی كوانا بۆ دێیەك یان شوێنێكی دیكە ماوە یانا؟.

١ـ جۆگەی گاوری گەورە ڕۆژی ١٩٨٠/٥/٢٣ كە ڕۆژی جومعە بوو ماڵم لە بەعقوبە بو تا هاتم لای شەهید علی سەلیم بەگی جاف كەماڵی لە كەلاری كۆن بو تا ڕووپێوی قەڵای شێروانە بكەم عەلی بەگ لە پێشەرمەرگەیەتێیدا بووەتە برادەرێكی خۆشەویستم لە گەڵم هات بۆ كەلاری نوێ و جۆگەی (گاوری) پیشانمدا وتی ئەم جۆگە گەورەیە پێش ئیسلام لەبەر ئەوە پێی دەڵێن جۆگەی گاوری و بۆ ئاودێریكردنی ئەم دەشتەی كەلار هاتوەتە دروستكردن. بەڕاستی لە كوردستاندا جۆگەی وا گەورەم نەدیبوئەگەر چەند هەندێ جۆگەی زۆر گرنگم دیبو لەوانە و بەناوبانگترینیان (جوا شەمیران) بو لە(وان) كەدەوڵەتی (ئورانۆ) دروستی كردوە. جۆگەی گاوری ئەگەر چەند گڵی زۆریشی تێدابو بەڵام پێم سەیر بو كە فراوانی لە دە متر كەمتر نەبو وابزانم كە پیوام(١٢ م) بو. پاشتر باسی ئەم ( جۆگەی گاوری) م پرسیوە لە چەن كەس ووتویانە ئەمە دەچێتە ئەوسەری دەشتی ڕۆژئاوای كەلار تا شاخی گومار و هەر شێوێك كەوتبێتە ڕێگای دیوار لەبەر جۆگەی دروستكراوە.

هەندێ كەسیش بە منیان ووتوە شاخەكە كون كراوە و جۆگە گەیشتوە (چیمەنی ئیبراهم سەمین) ی سەربە ناحیەی قەرەتەپە. نازانم ئەمە راستە یان نا [٥]

پاش كەلەگەڵا علی بەگ لەبەگزادەگانی تیرەی وەلەدبەگی جاف هاتین بۆ كەلاری نوێ كاك ئیبراهیم عبداللە سەمین كەلاری لەگەڵا منی نارد بو دیتنی بە شی یەكەم لە جوگەی گاوری كە پیشی دەڵێن جۆگەی دووكونەكە لای دێ ی ئەحمەد ئاوا ( گازینۆ ) كەچەند ماڵێك بو لەو شوێنە بەرزەی وەك گردەكە لەپشت جۆگە كە سنوری شارەوانی لێ نزیك بوە و چایخانەی ئەحمەد لەسەر بەرزێكەی بو

لەنك جوگە لەراسەری روباری سیروان کەوەك شوێنێکی گەشت گوزاری بو و لەبەر ئەمە خەڵك لەکەلارەوە دەهاتن ئەم چایخانەکە.

جوگە لە سیروان هاتوە لەڕۆژهەڵاتەوە لە سنوری دێ (بەردە سوور)بەپێ دیقەتم لە توبوغرافیەی شوێنەکە گرتوە لەم گردە شاخە بەردە لە دوو شوێن شاخ کون کراوە بوجوگە یانی ئاوی جوگە لێیانەوە هاتووە و نێوانیان بۆشایی هەیە و وان کون نەکراوە و شوێنەکە تێکچووە. کونی ڕۆژئاوا کەچومەتێیدا و پێوانم (١٩م) درێژەو (١م) پانە یانی فراوانەو بەرزی لە ناوەوە پتر بولە(٢م) و گڵیشی تێدا هەبو. (وێنە ١ وێنە جوگە و ئیبراهیم)



کونی دووەم کە ڕۆژهەڵاتە ویستم بچم نێوی تا بیپێوم بەڵام مارێك چوەتێیدا من و کاك ئیبراهیم نەمان وێرا بچینە ناوی بەڵام ئەمە درێژتربوو لە یێ رۆژئاوا (وینە ٢)



نێوان هەردووکیان بۆشایی هەیە بەدەوری (١٠٠م) یان کەمتر و شوێنەواری جۆگەم تێدا نەدیت چونکە تێکچووبوو ئیتر نازانم ئەم بەشەش هەر کون بوە و تێکشکاوە و هەرسێ بەشی یەك کون وەك یەك تونێل بوە یان نا؟

تێبینیم کرد سیروان رێی خۆی گۆڕیوە و هاتوە ژێر ئەم شاخەبەردەوە میقدارێك لێ بردوە چونکە شاخەکە ناسکەو جۆری (رسوبی)یە،کاتی جوگە هەڵکەنراوە روبار میقدارێك دوربوە.

جۆگە ئەگەر راستە راست چوبایە دەچولای گردی قەڵای شێروانە و پاشترلە هەندێ کەسم بیست کە بو گردی قەڵات چوە وابزانم مستەفا بەگی کەریم بەگیش وەها بو بە منی ووت لەدەفتەرەکەمدا وام نوسیوە. هەروەها نوسیومە ئەم جوگەیە جیایە لە (جوگەی گاوری) نێوان هەردوو کەلار و رەئیم  ئەوە بو کەبەنداوێك لە شێوە گەورەکەی ڕۆژهەڵاتی کەلار(چەمی حەمەی کەریم) هەبوە بۆ کۆکردنی ئاوی باران بۆ ئەم جۆگە گەورەیە بەڵام لە ڕۆژی١٧/١/٢٠١٨ لەکاتی نوسینی ئەم بابەتە بەهۆی تەلەفۆنەوە پرسیم لەبەڕێز حەسەن عەلی سلیم بەگ کەتا ساڵی (٢٠٠٦) بەرپرسی شوێنەوارەکانی گەرمیان بوکاتێ لێم پرسی ئایا شوێنەوارێکە دیوارێکی درێژ لە و چەمەدا نیە کە دیوار بەنداو بێت ووتی کونی جۆگە هەیە کەبەبەردی تاشراوی یە و ئاوی جۆگەی دووکونەکە لەو کونەوە لەچەمەکە تێپەڕبوە بۆ جۆگەی گاوری نێوان هەردوو کەلار.

هەروەها پرسیم لە بەڕێز شکور محەمەد حەیدەر کەوا چەند ساڵێکە بەرپرسی شوێنەوارەکانی گەرمیانە ئەویش وەهای ووت ووتیشی ئەو جۆگەی وەختێك ئاوی باران  تونێلی جۆگە بەدەر خستوە و لە ناوەوە چوار گۆشەیە و بەبەردو قسلە پێم ووت پێویستە بپارێزرێت و رێگە نەدرێت کەس خانو لە راستی ئەو لەتەنیشت رۆژئاوای ئەو چەمە ئاوابکە ووتی پاسەوانمان ماڵی نزیکیەتی و پاسەوانی لێ دەگرێت و شوێنەواری جوگە لەڕۆژئاوای چەم نەماوە و خەڵك تێکی داوە و خانولە سەر شوێنەکەی ئاوایان کردوە چونکە کەوتوەتە نێوشار بەڵام بەشێکی جۆگەی گاوری لای گردی قەڵای شێروانە دیارە و تەلبەند مان کردوە تاخەڵك تێکی نەدەن، ئیتر قەناعەتم بەقسەی ئەم دوو بەڕێزە کرد هەردوو جۆگە هەریەکن، بەراستی جوگەی گاوری مێژوویەکی گەورەیە بۆ کەلار و دەشتی کەلار پێویستە هەرپارچەیەکی لێمابێت بپارێزرێت،

پێویستە دائیرەی شوێنەواران هەوڵبدات کاتی جۆگەی بزانرێت، کاك حەسەن ووتی هەندێ خشتمان لە جۆگەکەدا دۆزی لە نزیك قەراغی رۆژئاوای شێوەکە (چەمی حەمەی کریم) ووێنەمان گرت و بردمان بو دائیرەی فەهەنگی باستانی لەتاران ووتیان ئەم خشتانە هی کاتی ساسانییە و ڕەنگە کەوتنی ناوی ئەنوشیروانی ساسانی بۆ سەرگردی قەڵای شێروانە راست بێت و ئەو ئەم جۆگەیەی دروست کردبێت و ناوی ئەنوشیروان لە ناوچەی قورەتوش لە بارەی هەنێشت هەیە وەك رەحلە ریچ لە ٢٩٦ دا هاتیە، چاپی یەکەم،

پاش ساڵی (١٩٨٠) چەند جار بە کورتی باسی ئەم جوگەی گاوریم کردوە لە هەنێ ووتارمدا و لە تەلەڤزوێنیشدا و جارێکیش لە ئیزگەی کەلاریش برای بەڕێز مستەفا سەعید علی دیدای لە گەڵا مندا کرد،

شایەنی باسە ابن حقول لە کتێبەکەیدا (صورةالا َرض) ل ٢٠٨ـ چاپی بیروت ناوی (بەردەسور) بە (سهرورد) هێناوە ئەگەر مەخسەدی بە سوهرەورد یانی سورە بەرد (چیاسورغ) نەبێت لەبەردی قورەتوو.

أبن الحوقل ساڵی(٩٨٢)زاینی کتێبەکی تەواوکرد .

**قەڵای شێروانە ساڵی ١٨٦٥**

من کە رۆژی (١٩٨٠/٥/٢٣) لە بەعقوبەوە هاتم کەلار ئامانجم روپێو و وێنە گرتنی قەڵای شێروانە بو بۆ لێکۆڵینەوەیەکی تەلا سازی لەبارەی ئەم تەلارە ی کە هونەری تەلار سازیەکەی نایابە لەهەموو کوردستان و عێراقدا و کارێکی تەلار سازی عەنتیکەیە کە محەمەد پاشا جاف کوڕی کەیخە سرەو کوری محەمەد پاشای جاف ئاوای کردە وەك چۆن تەلاری وەسمان پاشا لە هەڵەبجە شاکارێکی تەلارسازییە لە کوردوستان و عێراقدا و نمونەی نەبوە بەسێ مانگ لە پێش بێم بو قەڵای شێروانە لێژنەیەکی تایبەتیم هێنا لە بەرێوبەرایەتی شوێنەوارانی عێراق بۆ دیتن و  گرتنی وێنەی تەلاری وەسمان پاشاو بینا کەلەپوریەکانی دیکە لە هەڵبجەو سلێمانی و کۆیە و هەولێر و کتێبێکم لەبارەوەی داناوە و لەم ڕۆژانە چاپی دەکەم.

ئەن دوو شاکارە تەلار سازیە یێ دووکەسن لە سەرۆکەکانی گەورەترین عەشیرەتی کوچەری کورد کە عەشیرەتی جافە کەڕەنگە هەندێ کەس بڵێن ئەمە دووشتی دژ بەیەکن ئەگەر نەزانی عەقلییەت و بیرو هۆشی پێشکەوتوی سەرۆکەکانی جاف پشت بە پشت جیایە لەبێ سەرۆك خێڵەکانی دیکەی کورد بەگەکانی جاف خوێندەواران بوون خۆ مەحمود پاشا تەلارەکەی لە هەڵەبجە لە هی وەسمان پاشاگرنگتر بوە بەڵام مخابن نەماوە وەك خوالێخۆشبووحاجی (عبدالحمید) بەگی جاف بۆمنی باسکردوە لە دیدارێکی دوورو درێژیم دا لەگەڵا ئەو بەکاسێت لە ١/١/ ١٩٨٢و هەندێ رۆژی پاشترمەحمود پاشا هەڵکەوتوئەدەب دوست بو.بیری لە بەرپاکردنی شۆڕشێکی کوردی کردوە,

لەو ڕۆژەوە لە کەلار روپێوێکی زۆر وردی قەڵای شێروانەم کرد و ئەم بەڕێزانە لەکارەکانی مەتر پیواندن یارمەتی منیادا و سوپاسیان ددەکەم:

جەلال وەلی و عبدلستار شاهمراد و هلال حمید عبدللە. نەمزانیوە کەس لەپێش من ئەم کارە لەبارەی قەڵای شێروانەوە کردبێت بەڵکو من یەکەم کەس بومە روپێویەکە ئەوپەڕی وردی ئەوم کردبێ و شێوەی تەلار سازی نوسیبێت. پاشتر بەرێوبەرایەتی گشتی شوێنەوارانی عێراقم بەنوسین ئاگادار کرد کە نمونەی ئەم تەلارە نایابە لەعێراق و دەبێ بایەخی پێبدە و تەعمیری بکە.

زۆرم مەبەست بو بۆ مێژووی ئاواکردنی قەڵای شێروانە بزانم لەبەر ئەمە ڕۆژی ١٩٨٠/٥/٢٨ چوم بۆ بەغدا بۆ لای مستەفا بەگی کەریم بەگی فەتاح بەگی محەمەد پاشای جاف و باسی مێژووی ئاواکردنی قەڵاتم لێپرسی ئەویش ووتی کتێبێکم داناوە لەبارەی جافەوە و دەستنوسە و چاپم نەکردوە و کتێبە کەی هێناو پیشانمیدا تێیدا نووسیبوی محەمەد پاشا ساڵی (١٢٩٩)کۆچی کەدەکاتە ساڵی (١٨٨١زاینی) دا کوژراوە و دەڵێن شازدە ساڵا بەرلە کوشتنی قەڵای ئاواکردوە واتە ساڵی (١٨٦٥) ئاوای کردوە. ووتی ئاواکردنی شەش ساڵی خایاندووە ،

مستەفا بەگ ووتی محەمەد پاشا نامەی نوسیوە بۆ والی کەرمانشا کە (حشمە الدولە) بوە و داوای لێکردووە هەندێ کەسانی تەلار سازی زورشارەزا بوی بنێرن تا ئەم کۆشکەی بۆ ئاوابکەن، والیش (ئوستاندار) نامەی محەمەد پاشای ناردوە بۆ (نصرالدین شاە) و ئەویش یانی ناصرالدین شاە ئەندازیارێك لەگەڵا چەن وەستا (بەنایێك ) بوی ناردوە و کۆشکەکەی (قەڵای شێروانە) ئاوایان کردوە کەبۆ دانشتنی محەمەد پاشا بوە لە زستاناندا. مستەفا بەگ ووتی لەم شێوە تەلارسازییە ی قەڵا لە ناو چەی شیراز لە ئێران هەیە. مستەفابەگ ووتی لەپێش چل ساڵا عەلی محەمەدی کەلهوری کەلاری کە (١٠٣) ساڵا ژیاوە وساڵی ١٩٣٢ وەفات بووە و لەکاتی ئاواکردنی قەڵاتدا وەك کرێکارێك دێیدا کارکردووە بەمنی ووتوە محەمەد پاشا لەسەر گردی ئەسڵی (کەشوێنەواری کۆنە) گردێکی دیکەی دروستکرد تا قەڵات لەسەری ئاوابکە(واتا گردەکەی بەرزکردوە تاقەڵات بەرزبێت) و خەڵکێکی زۆری هێنا بۆ درووستکردنی ئەم گردە و ئەوانیش گڵیان دەهێناو داری گەورە وەك ئەستونیان لەوگڵەدا دەچەقاند و گڵیان دەدا دەوریا و دەیان کوتا تاقەیم ببێ و ئەوجا قەڵا لەسەر ئەم گردە دەستکردەی ئاواکرد. شایەنی باسە من ئەمەم لەغەیری مستەفا بەگیش بیستوە لەخەڵکی کەلار. من عوروسی یانی (ئاوێنەبەندی) هەیوانی قاتی دووەم لەماڵی مستەفا بەگ دیت لەکەلار و من وێنەی گرت چونکە

خۆیان لەقەڵاتدا دانەدەنیشتن و چۆڵیان كرد بو بەڵام ئاوێنە بەندیان واتە جامخانەیان هێنا بو تا خەڵك نەیشكێنن.

خوالێخۆشبوو مستەفا بەگ ووتی كەریم بەگی باوكم (كەماڵی لەقەڵاتدابو) هیچ تەعمیرەك لەقەڵاتدا نەكردو هیچ گۆڕانكاریەكی تێدا نەكردووە تەنیا نەبێ قاتی سێیەم كەیەك هۆدەیە كە گومەزی بو گۆری بەبانێكی راستە و راست و لە شێڵمان ووتی بانەكەی گومەزیەكی تر بو و لە سەر شێوەی رەشماڵی جاف ئاواكرابو گۆشەدار بو و لەهەر چوارلایەكەی لەو شوێنەی گومەز دەكەوێتە سەر (واتە قاعیدە) ریزە خشتی لەسەرە تا خوارەوە دانرابووبەسەر بانی قاتی دووەمەوە دەچوو تا دەگەیشتە هەر چوار بورجەكانی سوچی قەڵات، ریزە خشتەكە تەمسیلی هەرچوار گوریسی رەشماڵی(خیمە) ی (كوچەری جاف) ی دەكرد كەلەهەر چوارلای رەشماڵا گوریسی بەچوارسنگەوە دەبەسترێن تا رەشماڵا خوی بگرێت.

بەراستی كاتێ چوومە سەربانی قاتی دووە و ئەم هودەیەم دیت كە حەوت گۆشەبوو و لەهەرچوارلا ریز خشت لێیەوە درێژ بوبوو بەسەربانی قاتی دووەمەوە تا هەرچوارسوچەكانی قەڵات كە هەر سوچەك برجێكە- سەرم لەمە دەرنەچو نەمزانی ئەمە بوچی یە.

ئاوا كردنی ئەم هودەیە واتا قاتی سێیەم لەسەر شێوەی رەشماڵی جاف شاكارێكی دیكەی تەلارسازی ئەم تەلارە عەنتیكەیە.

شایانی باسە من لەشوێنێكی دیكەدا لەیەكێك لەدرەختەكانی گەڕانە كەلەپوریەكانم دا یان لەیاداشتمدا نوسیومە كەپتر لەیەككەس بەمنیان ووتوە دووسێ گوللە توپی روسی بەر سوچی ڕۆژهەڵاتی قەڵات كەوتوە كاتێ هێزی روسی لە جەنگی یەكەمی جیهانی دا گەیشتە ئەوبەری سیروان بەڵام ئەو سوچە نەروخا بەڵام د.حەسەن جاف دەڵێ تۆپەكان لەهودە گومەزیەكەی قاتی سێیەم كەوتبوون و گومەزەكەی روخاندبو ئیتر باوكم بە شێڵمانی تەعمیری كرد ئەم زانیاریە لە مستەفا بەگم وەرگرت زۆرگرنگە و گرنگترینیان مێژووی ئاواكردنیەتی كەساڵی(١٨٦٥) بوەكە نرخی تەواو نابێت زانیاریەكانی مستەفابەگ جێگەی باوەڕپێ كردنە چونك ەپرسیوە لەتەمەندارەكان و تایەكێك لەو كرێكارانە لەسەر قەڵات كاری كردون دیویەتی و زانیاری لێ وەرگرتوە كە عەلی محەمەد كەلاری یە كەباوكی خوالێخوشبوو ئەحمەد كەلاری تێكۆشەر و بەناوبانگ بوە. ئەگەر چەند زانیاریەكانم لەبارەی قەڵاتەوە لە وتارێكی تایبەتیدا بڵاوم نەكردۆتەوە وەك دەیان و یان سەدان بابەتی وە كەلام هەیەو فریانەكەوتوم بڵاویان بكەم بەڵام چەند جارێك كەمێك لەم زانیاریانەم بێجگە لە روپێوی و ڕدی قەڵاتم بڵاو كردوە لە نوسینەكاندا.

**تەعمیرە شێواوکەری قەڵات**

ڕۆژی ١٩٨٩/١٠/٢ صدام هاتە کەلار و لە تەلەڤزیۆنمدا دیت و خەڵکێکی زۆری‌لیِ کۆبووە مناڵێکیش بە کوردی پێی وتبوو وەرە شتێکی جوان پیشانت دەدەم ئەویش ووتبو ئەم منداڵە چی دەڵێ پێیان ووتبو وەها دەڵێ ئیتر صەدام وتبو باشە پیشانمدە و بەدەستی منداڵەکەی گرت و منداڵەکە بردە سەرقەڵات و ئەو هەموو خەڵکە لە دوایان دەچوو، صەدام کە قەڵات دیت زانیی شاکارێکی تەلارسازی یە و لە عێراق شتی وانیە زۆر کەیفی خۆشبوو و(٧٠٠) هەزار دیناری تەرخان کردە بۆ تەعمیرکردنی قەڵات کە ئەوکاتە مەبلەغێکی زۆر بو، پارێزگای سلێمانی داوا لە ئیدارەی شوێنەوارانی سلێمانی کرد سەرپەرشتی تەعمیرکردنی بکەن، و دائیرەکەش ئەندازیار عومەر مەحوی کردە ئەندازیاری تەعمیرکردنی کەعومەر نەلە ئەندازیاری کلتوری دەزانێ ونە بڕوایشی بە کلتوری تەلارسازی کوردی هەیە وەختەتیشی بو بە جێگری سەرۆکی شارەوانی و پاشتر بو سەرۆکی شارەوانی و ڕێگەدا بەوێرانکردنی دەیان و یان سەدان خانوی کەلەپوری لە نێو گەڕەکە کلتوریەکانی شاری سلێمانی و کێشەم لەگەلی زۆر بو لەبەر ئەم کارە و جارێك ووتارێکی یەك لاپەرەیی دژی ئەومان بڵاوکرد لە ڕۆژنامەی (هاوبیر) ژمارە ٢١ لە ٢٠٠٥/١/١١ دەبا عومەر کە دەوری لە شارەوانی سلێمانی هەبوو وەك باسمانکرد دژی وێران کردنی گەڕەکە کۆنەکانی سلێمانی وەستا با و دژی وێرانکردنی سەرچاوەی رەسەنی هونەری تەلارسازی کوردی کە ئەو گەڕەکانە بو وەستابا عومەر قەڵای کراس ( تغلیف) کرد بەبەردی حەلانی موسڵا تا بەردەکانی تەواوبو دیمەنی دەرەوەی قەڵا کە هەربزرکرد کەبە خشت و گەچ خشتێکی قەڵا ئەگەر ساغلەم بایە دەستکاری نەکردبا و تەنیا ئەو خشتانەی شکاون و رزیون خشتی نوێی لە شێوەی خشتە کۆنەکان خستبایە شوێنیان و دیمەنی دەرەوەی قەڵات دانە پۆشیبا بەبەردی حەلان ئیتر عومەر وئەو کاربەدەستە جاهلانەی ئەوکاتەی دائیرەی شوێنەوان قەڵاتیان شێوان، باسی ئەم شێواندنەیان لەلای وەزیریی رۆشنبیری سلێمانی، پاش چەن ساڵا من و ئیدارەی شوێنەوارانی سلێمانی داوامان لە بەڕێز شێخ محەمەدی شاکەلی کرد پارەپەیدا بکە بۆ تەعمیرکردنی ئەوەی ماوە لە قەڵات و پتر لە سەدهەزاردیناری ئامادەکرد و لیژنەی تەعمیرکردنی دروست کرد بە سەرۆکایەتی کەمال نوری کە بەڕێوەبەری شوێنەواران بو کەمالیش هەمان ڕێبازی گرتەبەر چەند هەوڵم لە گەڵی دا کەمن ئەندازیارێکی لێژنەبوم سودی نەبو ورەئی خۆیی فەرز کرد و ئەویش زۆربەی ئەو بەشەی مابو شێواند و توانیم بەشێکی کەم لە شێواندنەکەی قوتاربکەم کەبورجی باکوری رۆژئاوایە کەئەمهێشت داپۆشێ و دیمەنی ئەسڵیی بزربکە.

لەناوەوەش هەندێ شوێنی شێواند هۆدەی سەربان مابو و عومەر تەعمیری نەکرد بو هەوڵم دا کەمال نەیشێوێنێ، باسی ئەم تەعمیرکردنی دووەمەم بە دوور و درێژی نوسیوە لەیاداشتم دا، ئەوکات شێخ محەمەد شاکەلی وەزیری ڕۆشنبیری ئیدارەی سلێمانی بو.

**چۆن ئاوەدانی پەیدا بوە لە جێگەی شاری کەلاردا**

**ـــ لێکۆڵینەوەیەکی دەنگی ـــ**

زانینی کەی و چۆن ئاوەدانی پەیدا بوە لە جێگەی شاری کەلار دا زۆرگرنگە بۆ مێژووی دروستبوونی شارەکە. نەمزانیوە کەس لێکۆڵینەوەیەك لەم بارەوە کرابێ لەبەر ئەمە بە مۆبایل پەیوەندیم کرد بەچەند برادەرێکی ڕۆشنبیر و شارەزا لەم بوارەوە و هەرچی زانیاری لەلایان هەبوە بەدەنگیانم تۆمار کرد بەڕیکۆردی دەستی و زانیاریەکانیش خستمە سەر کاغەز کە ئم بەڕێزانەن :

خەسرەو محەمەد سەعید بەگ جاف و حەسەن علی سەلیم بەگی کەلاری و دکتۆر حەسەن کەریم جاف و شاهۆ مستەفا بەگی جاف و ساڵەح هەلاج و مستەفا سەعید عەلی و علی بەگی کریم بەگ و سورەیاخانی خێزانی کە کچی عەلی بەگی رەزا بەگە کەهەموو خەڵکی کەلارن و هەروەها شێخ محەمەدی شاکەلی و شکور محەمەد حەیدەرو سوهەیل خورشید کە ئەم دوانەی ئاخیر خەڵکی کفرین، پاشتر دیدارم کردووە لەگەڵ دکتۆر عماد عبدالسلام ی مێژوونووس و دکتۆر ئەحمەد کامل ی شوێنەوارناس. هەندێکیان چەن جارێك دەنگیانم تۆمارکردووە و هەرجارێك بە دیدارێك دەژمێردرێت ، هەبوە دەوری دەجار تەلەفونم بۆ کردوە پرسیاری کوڕتم لێ پرسیوە بەڵام دەنگیم تۆمارنەکردوە.

ئەم دیدارانە بە دەنگیان دەپارێزم چونکە دەنگیش بە ڵگەنامەیە و دەنگەکانیش دەخەمە ناو سایتی خۆمدا ئەم دیدارانە مێژووی سەرەتای پەیدا بونی خانوو وجێنشین بوون لەشارە جوانە پڕلە جموجوڵەکەی کەلار دەخەنە ڕوو وە دەچەسپێنن. ئەگەر چەند هەموویان هەندێ جار نارێکی هەیە لە نێوانیان لەسەر هەندێ خاڵ یان هەندێ ئاگادارن و هەنێ ئاگادار نین لەو بارەوە .

ئەم بە ڕێزانە تەنیا رەنگە یەکێکیان نەبێ کە پاش بیست و سێ ساڵ هاتووە کەلار دەنا هەموویان رێکن لەسەرگرنگترین خاڵ کە بڕبڕەی پشتی مێژووی شارەکەیە ئەویش ئەوەیە کە هیچ خانویەك لە جێگای شاری کەلاردا نەبوە لە پێش ئەوەی خوالێخۆشبو مستەفا بەگی کەریم بەگی جاف کە خەڵکی دێی کەلار (کەلاری کۆن) ە لە ساڵی ١٩٥٤ مەکینەیەك بۆ ڕاکێشانی ئاو لە ڕووباری سیروانەوە بکڕێ و بهێنێ بۆ کشتوکاڵ کردن لە زەوییەکانی بنەماڵەی خۆیان کە (١٠٠ یان ١٥٠٠ دۆنم بووە) لەو جیگەی کە یە کەم جار خانوی تێدا پەیدا بووە بوە بە بناغەی شاری ئێستای کەلار کە ژمارەی دانشتوانی پترە لە (٢٠٠ هەزارکەسە. ئەو ساڵە یان بڵێین مانگی ئایاری ساڵی ١٩٥٤ بو بە مێژووی ئەم شارە.

مستەفا بەگ مرۆڤێکی خوێندەوار بووە و کتێبێك لەبارەی جافەوە داناوە و ئەندامێکی چالاکی حزبی هیوا بووە و پاش دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان ی بوە تە ئەندامی و لە ڕۆژی یەکەمی شۆرشی کوردستانیش بوەتە پێشمەرگە واتە مێژویەکی پڕلە کوردایەتی هەبوە . مستەفا بەگ لە دایکبووی (١٩٢١) بوە و لە ڕۆژی (١٩٩٧/٧/٣١ ) لە بە غدا کۆچی دوای کردو قەبری لە گۆرستانی سەیدخەلیلە لە کەلار، علی ڕەزابەگی فەتاح بەگی محەمەد پاشا جاف کە ئامۆزای بو لە کڕینی مەکینەکەدا شەریك بو

و ماڵی لە قزەربات بو و ساڵی (١٩٦٨) کۆچی دوای کرد و قەبری لە نێو مزگەوتی محەمەد پاشا جافە لە قزەربات.

**مەکینە:**

عەلی بەگی ڕەزا بەگی فەتاح بەگی محەمەد پاشای جاف و مستەفا بەگ بە شەراکەتی لە مانگی ئازاری ١٩٥٤ مەکینە (ماتور) ێکی سەوزی کڕی لە شەریکەی (ولیەم پرسی) یبریتانی لە بەغدا سەر بە شەریکەی بازرگانی ڕۆژهەڵاتی بریتانی کە هێزەکەی (٤٠) ئەسپ بوو بۆ راکێشانی ئاو لە ڕووباری سیروان بۆ ئاودێری کردنی بە شێك لە دەشتی شێروانە کەبۆتە ناوەنی شاری کەلار

لەبەر ئەوەی لافاو پەیدابو بەتایبەتی لەبەشی ڕۆژهەڵات لە بەغدا و ڕێگەی ڕۆژهەڵاتی بەغداد نەما ماتۆرەکە، بردە موصڵا و لەموصڵەوە هێنایە کەلار. شوفێرەکەش( سلێمان جەلال ) ی خەڵکی جەلەولا بو.

پاش کەمەکینەی هێنا حکومەت نەهێڵا ئاو لە سیروان راکێشێ بەڵام بەهۆی داود بەگی فەتاح بەگی مامی کە ئەندامی پەرلەمانی عێراق بووئیجازە وەرگرد یان هەر خوی لە موتەصەرفی کەرکوك ئیجازەی وەرگرد پاش ئەوەی جوگەیەکی ئاو بە حەفارەی ولیەم پریسی لە ڕووباری سیروان بە دوری یەك کیلۆمەتر راکێشا و حەوزی ئاوی دروستکرد مەکینەش بە دوری دەوری سەد(١٠٠م) ئاوی لە حەوز راکێشا بۆ سەر زەویکانی مەرەزە ( برنج )، لەو شوێنەی مەکینەی‌لیِ دانابو هیچ خانوەیك نەبولە پێش مستەفا بەگ هودەیەك لەسەر مەکینە کە ئاواکرد و لە مانگی ئایاردا خانویەك ئاوا کرد بۆ ئیسماعیل مەحمود (ئیسماعیل فیتەر) کە ئیشی بە مەکینەکە دەکرد . خانوەکە سێ هۆدە و چێشتخانەیەك بوو کە لە کەرپوچی خاو ئاواکرد و بانەکەش دارەڕابو. خانوەکە لای مەکینەکە بوو مستەفا بەگ خۆی ماڵی لە دێ گەلار بو بە دەوری دووری (٤کم) لە شوێنی مەکینە و ئۆتۆمبیلی هەبو پێ هاتوچۆ دەکرد. وەختێکی ئیسماعیل شۆفیری کەریم بەگ بوو کەریم بەگ لە ئەم خانوە یەکەمین خانو کە هاتە ئاواکردن لەو جێگایەی بوەتە شاری کەلار ، هەردوو برای ئیسماعیل شکور و شەوکەوتیش لە خانوەکە پەیدابوون. پاشتر هەر لەو ساڵەدائەمینی حاجی ئەحمەدی خەڵکی گوندی (بنگرد) ی باشوری قەڵای شێروانە ماڵی هێنایە لای مەکینە یانی خانوی لەوێ بۆخوی ئاواکرد. کوێخای بنگرد بو لە تیرەی (عەمەڵە) ی جاف کە پاشتر ئەمین بو یەکەمین موختاری کەلار. پاش ئەمین(عەولا) ناوێك لە خەڵکی بنگرد و قالە ئۆتۆمبیلچی هەر لەو ساڵەدا هاتن و خانوو بۆ خۆیان ئاواکرد لای مەکینەو هەروەها (علی وەلی) یش لە بنگرد دەوری دوانزە ماڵا بو زوربەیان جاف بوون و چەن ماڵێکیش (لەك) بوون، پاش ئەمانە خەڵکی بنگرد هەموویان دێیەکەیان چۆڵا کردە هاتن لای مەکینە(بنگرد) دەوری یەك کیلۆ مەترو نیو دوور بو لە مەکینە واتە شاری کەلار لەسەر دێ‌ی بنگرد ئاوانەبوە و دێی بنگرد کاکڵاو بناغەی شاری کەلار نەبوە بە ڵکو پاش هاتنی خەڵکەکەی لای مەکینە و چۆڵا کردنی دێکەیان بە چەند ساڵا کەلاوەکانی بنگرد هەر مابو و دیار بو. نە بنگرد و نەدێی کەلار ئەسڵی شاری کەلار نیە. خەڵك بەو ماڵانە لای مەکینەیان دەوت : ماڵەکانی مەکەینەکە. تاساڵی١٩٦١ یان تا ساڵی ١٩٦٥ کەدەوری (٤٠-٥٠) ماڵالای مەکینەکەکۆببو. دانشتنی خەڵك لەم شوێنەدەشتەدا نەپچڕا بەڵکو هەر بەردەوام خەڵك تێیدا کۆ

بو. تا بو بە ئەم شارە ئەگەر چەند کانی ئاو لە شوێنە نەبو بەڵام مەکینە ئاوی زۆری هێنا بو. لەبەر ئەوەی ئەو شوێنە کەوتبوە سەر ڕێگای گشتی دەربەندیخان و جەلەولا و خانەقین و بەغداد بەتایبەتیش کە ڕێگاش قیرکراو قیرکردنەکەش تەواو بووپێش ساڵی١٩٦٠ ـ خەڵك بە خێرا خێراتێیدا کۆبوەو لە پێش (١٩٦٠) چاپخانە و چێشتخانە و دووکان پەیدا بو. کارکردن لە بەنداوی دەربەندیخان و تونێلی دەربەندیخان لەلایەن کۆمپانیاکانی بریتانی و فەرەنسی و ئەڵمانی و ئەمریکی تا تەواو بو لە پایزی (١٩٦١) قەرەباڵەخی درووستکرد لەسەر ئەم ڕێگایە و ئەم شوێنەش سودی لە هاتو چونەی وەرگرد لە زیادبوونی ئاوەدانی دا.

**مەکینەکە تا رۆژی (١٢ ی ئەیلولی ١٩٦٦) ئیشی کردووە.**

لەبەر ئەوەی مێژووی شار لەم مەکینە دەست پێدەکات و ئەم مەکینەیە بوەتە هۆی پەیدابوونی ئەم شارە سومبولەکەی مەکینەکە دەبێت، پێویستە شوێنی مەکینە بدۆزرێت و ئەگەر کرابیتە خانو دەبێ خانوەکە بکڕدرێت و بروخێندرێت و لە شوێنەکەیدا سەکویەك دروست بکرێت و مەکینەیەك لە چەشنی خۆی لە سەری دابنرێت و ئەگەر بەدەست نەکەوت کە خۆی و یان پارچەکانیش نەماوە ــ نیشان (رەمز) ێك بوی دروست بکرێت لە سەر سەکۆیەك(٦)

لەڕووی مێژویەوە مستەفا بەگی کەریم بەگ وعلی بەگی رەزا بەگ دەبنە دامەزرێنەری شاری کەلار چونکە ئەگەر ئەوان نەبوان ئاوەدانی نەدەکەوتە ئەو شوێنەو شاری کەلار درووست نەدەبوو بۆ دڵنیایی کردنی خەڵك لەم بارەوە ڕۆژی (٦ و ٧ ی شوبات ٢٠١٨ ) دیدارم تۆمارکرد بە عەرەبی لە گەڵا دکتۆر عماد عبدالسلام لە مێژوو نوسە گەورەکانی عێراق کە ئەوا چەن ساڵە لە هەولێر دادەنیشێ. هەروەها لە (٧/٢/ ٢٠١٨) دیدارم تۆمار کردووە بە عەرەبی لەگەڵا دکتۆر ئەحمەد کامل لە شوێنەوارناسەکانی عێراق کە بەڕێوەبەری گشتی پێشووی هەموو مۆزەخانەکانی عێراق بو تەنیا مۆزەخانەکانی هەرێمی کوردستان نەبن. بێ ئەوەی ناوی کەلار و یان مستەفا بەگ و علی بەگ بهێنم لێیانم پرسی ئەگەر یەکێك پرۆژەیەکی ئاودێری لە شوێنێك دامەزراند کە پێشوتر نە خانو و نە ئاو لەو شوێنە نەبو و یەکەم خانو لەو شوێنەدا ئاواکرد و پاشتر خەڵك خانو بۆ خۆیان لەو شوێنە ئاواکرد و خەڵك لەوێ کۆبون و ئەو شوێنە وردە وردە گەورە بو تا بوە شار کێ دەبێتە دامەزرێنەری شارەکە هەروەها وتیان دامەزرێن ئەو کەسەیە کە یەکەم جار خانوی تێدا ئاوا کردوە. قسەکانی هەردوان بە عەرەبیم نوسیوەو وەریشم گێڕاوە سەر کوردی وەك دیدارە کوردیەکان. دەنگی هەردوان لەگەڵا دەنگی ئەوانی دیکە لەلای خۆم دەپارێزم و دانەیەکیش بو ئێوە دەنێرم لەگەڵا دەنگی ئەوانی دیکە هەموویان. هیوادارم بیپارێزن لە دۆسیەی کەلاردا و ئەو دەنگانە هەموشیان دەخەمە نێو سایتەکەم.

**ئەم توێژینەوەی مامۆستا عبدالرقیب یوسف توێژینەوەیەکی تێرو تەسەلە کە ٦٤ ئەی فۆری دەستنووسە لەگەڵ چەند پاشکۆیەك و تیایدا چاوپێکەوتنی لە گەڵ ٢٣ کەسدا کردووە، بەڵام لەبەر سنورداریی قەبارەی بڵاوکراوەکەی یادی کەلار نەتوانرا کۆی بابەتەکە بڵاو .**

**پەراوێزەکان :**

١ـ لەبارەی تەپە ڕەحیم وە بە ڕێز شکور محەمەد بەرپرسی شوێنەوارەکانی گەرمیان بەمنی ووتوە لە (٢٠١١ـ٢٠١٢) پشکنینمان تێدا کرد و دەگاتە کاتی حەلەف و دکتۆرێکی شوێنەوارناسمان لە بەغدا هێناوە بۆ ئەم کارە.

٢ـ باسی ڕێگا لە کەلار تا ( بت خانە ) م وەرگرتووە لە بەرێز شێخ محەمەدی شاکەلی و لە دیداری (٢٠١٨/١/٣١ ) لە گەڵا شێخ محەمەد دا هەیە.باسی ئەم ڕێگایە هەیە لە ووتارەکەمدا (شوێنەوارەکانی پەیکوڵی)گۆڤاری هەزار مێرد (٥) ساڵی ١٩٩٨ بە شێوەیەکی گرنگتر هەیە لە باسەکەمدا: (دۆزینی شاری شارەزوور (نیم ئەزراە ) لە بیستان سور) گۆڤاری ژین (٧) ساڵی ٢٠١٥.

٣ .ئەولیا چەلەبی نوسیوە هارون الرشید خەزنەدارێکی خوی کەناوی (زەنگ) بو ناردوە

و ئاوای کردوە و ناوەکەی بوەتە(زەنك أباد) بەڵام ریچ بردوە سەر بنەماڵەی (ئەتابەگی زەنگی) کە تا ناوچەی کەرکوك و شارەزوور لەژێر دەستی دا بوە لەگەڵا سوریادا لەوەختێکدا لەسەدەی دوازدەیەمدا و پایتەختەکەی موصڵا بوە. هەندێ لەنوسەرانی کورد دەڵێن زەنگاباد لە ( زەند ئاباد ) هاتوە. ئایا هەندێ لە عەشیرەتی(زەند) لەپێش سەدەی هەڤدەیەم هاتوەتە ئەم شوێنە تابڵێن ئەمەراِستە؟

٤ .زانای مەزن (ئەلبێرد ئەبونا) ی پێشخابوری وەریگێڕاوە بۆ عەربی و لە ساڵی ١٩٦٦ لە موصڵا چاپی کردووە. لە کتێبەکەمدا (حدود کوردستان الجنوبیه تاریخیا و جغرافیا خلال خمسه ألف عام) ل ١٢٢چاپی دووەم ساڵی ٢٠٠٥ بەگومانەوە ووتومە ڕەنگە مەڵبەندی سەنجاغی زەنگاباد کفری بێت. لەهەمات لاپەڕەیەمدا باسی زەنگابادی مەندەلیشم کردووە. ناوی سەنجاغ زەنگاباد نەهاتووە لە نێوناوی سەنجاغەکانی (ویلایەتی شەهرەزوور) کەمەڵبەندەکەی کەرکوك بو و سوڵتان سلێمان دروستی کرد کاتی بەغدادی گرت لە (١٥٣٤) بەڵکو ناوی سەنجاغی (داودان) و سەنجەغی (جبل حمرین) هاتووە کە (قەرەتەپە و بابلان) بوە. هەمان کتیبمان ل ١٢١.

٥ـ ئیبراهیم سەمین (ئیبراهیم لەك) : یەکێك بوە لە خەلیفەکانی گەورەترین شێخەکانی خوی أبوالوفاْ الحلوائی بووەو هەروها شێخ باولین کەڕەنگە ( شێخ باوە) بێت و( شێخ بزین) ی گەورەش لەخەلیفەکانی ئەو بوو ،شێخ عەدی کوڕی موسافیریش لەقوتابیەکانی ئەوە.

حولوانی لە (١٠٢٦-١١٠٧ )ژیاوە . تەماشای ئەم کتێبە بکە (تژکره المقگفین فی مناقب أبی الوفاو تاج العارفین) لێکۆڵینەوەو بڵاوکردنەوەی د.عماد عبدالسلام و د.زرار صدیق أربیل (٢٠١٦) و تەماشای د.موستەفا جواد ( قبیله چاوان الکردیه المنسیه) لا٢٤ .أبوالوفاو (محمد ) لەتیرەی بەگزادەی جاف بووە

٦. لە دیدارمدا لەگەڵ علی بەگی کەریم لە ٢٠١٨/٢/٦ عەلی بەگ ووتی شوێنی مەکینە ئیستا مەغزەنی خالدی حاجی رەشیدی خەڵکی دێ ی بەرلوتە. لەباشوری تەلاری شێخ جەعفەر لەوبەری شەقامی گشتی .

## رادیۆیی دەنگی گەرمیان..

## وەک یەکەم رادیۆی دوای راپەرینی بەهاری ١٩٩١ی خەڵکی کوردستان..

**ئەحمەد محەمەد قادر**

هەل و مەرجێکی نوێی سیاسی پاش کۆتایی هاتنی شەڕی هەشت ساڵەی نێوان( عێراق- ئێران) و داگیرکردنی کوتوپڕی کوەیت لە لایەن سوپای عێراقەوە هاتە کایەوە،شەری کەنداوی بە دوای خۆیدا هێنا، ڕاپەرین لە باشوری عێراقەوە دەستی پێکرد،بە هەزاران سەربازی کورد لە شەرگەکان هەڵهاتن و رووەو کوردستان گەرانەوە..

پاش پرۆسەی بەدناوی (ئەنفال)،یەکێتی نیشتیمانی کوردستان هێزەکانی خۆی بۆ سەرسنوری ئێران و ئەودیوو رەوانەکرد بوو،لە چەند ناوچەیەکدا گروپی چەکداری پارتیزانیی هێشتبووە..ئەم هەلومەرجە ساسیەییەو لە بەریەك هەڵوەشانی ئیرادەی بەرگریکردن لە رژێمێکی دڕندەی(بەعس)و،ئامادەگی جەماوەر بۆ راپەرین و بەگرخستنی (رادیۆی دەنگی گەلی کوردستان)،ئەمانە فاکتەری راپەرین بوون و لە رانیەوە ئەم تەلیسمەی زوڵم و زۆرداری بەعس تێکشکێنرا،زۆری نەخایاند تاسنوری خانەقین ،جلولا، شاری کەرکوك و ..هتد..رزگارکران..



پاش ڕاپەربنی بەهاری ١٩٩١ی خەڵکی کوردستان و ئازادکردنی پانتاییەکی فراوانی خاکی کوردستان،هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتیمانی کوردستان پاش ساڵێ بەڕێوە چوو..

هەلومەرجەکە پێوستی بە هۆشیاری هەمەلایەنە هەبوو،چونکە رۆخانی بەعس و بەدەرنانی لە خاکی کوردستان ،دەیان گرفتی جۆراو جۆری (سیاسی ،کۆمەڵایەتی ،فەرهەنگ ،ئابوری...) لێکەوتەوە..هەنگاوێکی عەقڵانی کە ئەم کەف و کۆڵ و گرفتانە ئەهوەنکاتەوە،کەناڵێکی راگەیاندن بووکە لێوەی هوشیاری بە گوێی خەڵکدابدرێت ودەسکەوتە گەورەکان نەکرێنە قوربانی ململانێی سیاسی و پاوەن خوازی ،(رادیۆی دەنگی گەرمیان) لە ئاوەها بارو دۆخێکدا دامەزرا..

## بیرۆکەی دامەزراندنی (رادیۆی دەنگی گەرمیان ):

مەڵبەندی رێکخستنی (ی.ن.ك)،کە ئەوکات مەڵبەندی (کەرکوك) بوو،بارەگاکەی لە دەربەندیخان بوو،بەرێز(حەسەن جیهاد ئەمین) بەرپرسی کۆمیتەی رێکخستنی کەلار وهەڤاڵ (رەحمان خانی ) پەیامنێری رۆژنامەی (کوردستانی نوێ) بوو،خاوەنی بیرۆکەکە بوون..پەیوەندیان بە نوخبەیەکی رۆشنبیری ناوچەکەوە کرد ،لە کۆتاییدا ئەم بەرێزانە وەك دەستەی دامەزرێنەر ئامادەی کارکردن بووین:

١ -ئیبراهیم باجلان –بەرێوەبەر.
٢-موشیر عارف – ئامادەکاری بەرنامە .
٣-مەجید سالەح –نووسەر،
٤-سەربەست ئەحمەد –دەرهێنەر ،
٥-مەجید زیرەك – دەرهێنەر،
٦-جەمیل محەمەد ئیبراهیم – بێژەر.
٧ -خوالێخۆشبێت :ئەمین سالەح – بێژەر.
٨ -ئەحمەد محەمەد قادر- بێژەر.
٩-م. ئەحمەد سەعاتچی –هونەری،
١٠ -م. قادر سەعاتچی – هونەری..

راستەوخۆ لە لایەك بەرپرسی کۆمیتەی رێکخستنی کەلارەوە سەرپەرشتی کاروباری رادیو دەکرا.. بودجەکەشی لەسەرمەلبەند بوو..لەسەر شەپۆلێکی مامناوەندو بەسیستمی (a.m) بەیانیان و ئێواران، پەخشی بەرنامەکانی رۆژانەی خۆیدەکرد. پاش کەمتر لە ساڵێ بەشی عەرەبیشمان لە کاتەکانی ئێوارەدا کردەوە ئەم بەرێزانە بەرێوەیان دەبرد :

١-مامۆستا ئیبراهیم باجەڵان.
٢-حەکیم حسێن.
٣-سەروەر فایەق.
٤-مەریوان محەمەد ساڵەح.
٥-جوان ئیبراهیم باجەلان.
٦-بەناز خالد .



لەناوەڕاستەوە: ئیبراهیم باجەڵان ،سەربەست ئەحمەد. بەناز خالد، تابان عەبدوڵا، ئەحمەد محەمەد قادر، جەمیل محەمەد، خالیدە مەجید، موشیر عارف، مەجید زیرەك، حەکیم حسێن، خوالێخۆشبێت ئەمین ساڵەح. ساڵی (١٩٩٨)

## بۆچی رادیۆی(دەنگی گەرمیان) کاریگەری هەبوو ..؟

پاش راپەرین ،گەمارۆی ئابووری سەر عێراق بەگشتی و کوردستان بەتایبەتی، کارەساتی دروستکردبوو، باشترین کەناڵێ کە لێوەی هوشیاری و هەواڵی دونیاو دەوروبەری بگەیاندایە تەنها رادیۆ بوو، چونکە ئەوانی دیکە هەرنەبوون، هەندێکیش کە هەبایە زۆر گران بوون، تاکوتەرا تیڤی لە ماڵان هەبوون، رادیۆ: هەرزان بوو، بە ئاسانی دەگوێزرایەوەو هەڵدەگیراو دەبرایە هەموو شوێن و جێگایەك، زۆربەی ئۆتۆمبێل و دوکاندارو عەرەبانچی و شوانکارەکانیش هەیانبوو...

لەم سنوورە (رادیۆی گەرمیان )، یەکەم رادیۆی لۆکاڵی ی بێرکابەربوو، دواتر رادیۆی حزبی شیوعی و دواتریش دەنگی یەکگرتوو هاتنە کایەوە.. بۆیە دەنگ و سەداو کاریگەری دەنگی گەرمیان زۆر دەنگی

دایەوە ،چونكە كارمەندەكانی بەزۆری دەرچوی كۆلێچ و پەیمانگاكان بوون ، حەزوو ئارەزوی كارەكەو خزمەتكردنمان تیابوو، جەماوەری یەكێتیش لە پلەی یەكەمدابوو...

## دەسپێک و کاری رۆژانەی رادیۆ:

سەرەتا بە سرودی (مەشخەڵان) و دواتر چەند دەقیقەیەك لە قورئانی پیرۆز پەخش دەستپێدەكرد..دواتر بەرنامەی شنەی بەیان بۆ ماوەی( ٤٥) دەقیقە، لە سەری سەعاتەكان هەواڵ، زۆربەی رۆژەكان جگە لە شنەی بەیان، دووبەرنامەی دیكەمان هەبوو، ناوبەناوو بەپێی پێوەیستی ئاگاداریمان هەبوو..

بۆ بۆنە نیشتیمانی و نەتەوەییەكان و یادی شەهیدە دیارەكان و داستانەكانی هێزی پێشمەرگەو هەر روداوێكی تایبەتو پێویست ..هتد بەرنامەی پێویستمان هەبوو...

هاوكات پەخشی ئێوارانیشمان هەبوو بە هەردوو زمانی (كوردی و عەرەبی )...

## بەتەمەنترین بەرنامەی رادیۆ:

شنەی بەیان ،ئەم بەرنامەیە (٢٠ساڵ) بەردەوام بوو ،واتە لە دامەزراندنیەوە تا داخستن، بەرنامەیەكی رۆژانە بوو، ماوەكەی (٤٥)دەقیقەبوو، لە هەشت و چارەكی بەیانەوە تا نۆ ،دەسپێكی بەرنامەكە بە گۆرانی (لەیارەوەی خوالێخۆشبوو مەرزییەی فەریقی) دەستی پێدەكرد، لە نێو ئەم بەرنامەیەدا جگە لە گۆرانی كوردی لە نێوان برگەكاندا لێنەدەدرا ،برگەكانی :شیعر ،وتەی جوان و گونجاو ،بەسەرهات و روداوی سەیر ،ئامۆژگاری و رێنمای ونوكتەو قسەی خۆش بە جۆرێك كەسمان لێزویرنەكا، زۆربەی رۆژەكان چیرۆكی رادیۆیمان هەبووناوی (عەزەو مینە) ،بە زۆری ئەم كارمەندانە دەماننوسی و پێشكەشمان دەكرد(خوالێخۆشبوو: ئەمین ساڵەح ،مەجید ساڵەح ،جەمیل محەمەد ،ئەحمەد محەمەد، موشیر عارف..)،رۆژانە بە دەنگی ژن و پیاوێك شنەی بەیان ئامادەو پێشكەش دەكرا...



(ئەحمەد محەمەد و سوییە عوسمان..لە كاتی پێشكەش كردنی بەرنامەی (شنەی بەیان)، رادیۆی دەنگی گەرمیان ساڵی ١٩٩٤)

## هەواڵەکان چۆن ئامادە دەکران..؟

رادیۆ لە ( ١-٦-١٩٩٣) دامەزرا ،ئەوکات هیچ بڵاوکراوەیەك لەم سنوورە نەبوو، تەنها (کوردستانی نوێ) دەگەشتە کەلار جارجارەش نەدەهات..هەواڵگریمان لە نێوان بێژەرەکاندا کردبوە نۆبە ،چونکە خەرجیمان زۆر کەم بوو، پێویستییەکان نەبون و هەشبا زۆر گران بوون (ریکۆردێکی بچوك ) نزیکە (٧٠٠) دیناری سویسری بوو،کاسێتێ بەتاڵ (١٠ دینار )بوو، بۆیە هەرئێوارەی لێ دەهات ماڵێکمان دەکردە دی کە تەلەفزیۆنی بوایە، (ئەوکات رەش و سپی )بوو، بە تەسجیلێکی دەبڵ کاسێتی گەورەوە کەهێندەی سەرینێکی کوردی دەبوو،دادەنیشتین بە دیار هەواڵی کاتژمێرهەشتی گەلی کوردستانەوە، زۆر جار پەخش هێندە خراپ بوو، بەهەزار نزاو پارانەوە نێوەو ناتەواو تۆمارمان دەکرد، دواتر بەچی دەردەسەریەك دەمانوسیوە!..

سەرچاوەی دووەممان ،بە پێ گەران بوو ئەم فەرمانگەوە بۆ ئەوی دیان، یان بەرێکەوت هەندێ هەواڵی ناوخۆشمان دەچنیەوەو جارجارەش لە رادێو جیهانییەکانەوە بەردەستمان دەخست..(ئەمە هەربەدەم ئاسانە!!..)..

### موچەکانمان:

هەمووومان لە موچەدا یەکسان بووین (لیستی موچەکانمان بە پێی کارو ناونیشانەکانمان بوون بەڵام خۆمان بڕیارمان دا موچەکانمان یەکسان کەین، تەنانەت تا دواساڵەکانی تەمەنی رادیۆ(٢٠١٢) کە نزیکەی شەش ساڵ بەندە بەرێوەبەری بووم، موچەکانمان (٣٥٠)هەزار دیناربوو، رادیۆ سەیارەی نەبوو، لەسەرەتاوە تاچەن ساڵێ بۆ فێنککردنەوەی خۆمان و جیهازی پەخش تەنها یەك موبەریدەمان هەبوو، ئەویش پاش فێنککردنەوەی ئامێری پەخش نزێکی بەر ئێمەش دەکەوت..! هێندە بێ پارەبووین لە خواردن و خواردنەوە تەنها خاوەنی (ترمۆزێك)ئاوبووین، تەنانەت چایشمان نەبوو، کارەکانمان بە ئۆتۆمبێلی خۆماندەکرد، چەند رۆژ موچە دوابکەوتایە بۆڵە بۆڵ نەبوو چونکە دەمانزانی بۆ هەموو دەزگاکان نییە، نێوان بەرپرس و کادیری خوارەوە ئاسمان و رێسمان نەبوو، زۆر جاریش ریزمان دەبەست بۆ موچە، ئەوبرادەرانەی کە لە گونی‌یەکدا موچەکەیان لە بەردەمیان دادەنا و دابەشیان دەکرد دەیانگوت: ببورن نیو موچەیە ،هەندێ جار شەدەی پارەکان نوقسان بوون، ئاسایی وەرمان دەگرت، چونکە خزمەتکردنمان بەرچاو بوو، باوەرمان پێ هەبوو، بەهەر کوچەوکۆڵان و بازارو ماڵێکدا دەرۆیشتین،دەنگ: دەنگی گەرمیان بوو، کاریگەریمان لە سەر کۆمەڵگە هەبوو،(ئەگەر نەچێتە قاڵبی وەتەنیاتەوە ) نەمان دەوت موچە هات بەڵکو دەگوترا، یارمەتی هات..ئەم چەمکە لێکدانەوەی زۆر هەڵدەگرێ، بۆ ئێستاو ئەوسا!...

## ئەوبەرێزانەی کە کارمەند نەبوون وبەرنامەیان ئامادەو پێشکەش دەکرد،بێبەرامبەر:

٢٠ساڵی تەمەنی رادیۆ و هاوکاری رۆشنبیرانی ناوچەکە ،لە ئەژمار نایەن،بمبورن ئەوانەی لەبیرم دەچنەوە،هەرباشە ئەمانەش بەم دواییە لە زیهن و بیری خۆمدا بچنمەوە:.

(م.ئەحمەد شاکەلی، حەسەن عەلی سەلیم ، خوالێخۆش بوو مامۆستا فوئاد مامەخان ،دکتۆرە چرۆ، کاک غازی ستار (غازی زراعە )، رەحمان خانی، مامۆستا رزگار حاجی حەمید، ژیان حەمە سعید، مامۆستا مەلا تایەر وتاری هەینی ی هەبوو، ماوەیەکیش بەرنامەیەکەکی ئەدەبێ ئامادەو پێشکەش دەکرد. بەدریە حەسەن ،جیهان و شیلان ،تابان شیخ عەبدوڵا ،کاک جلال شێخ نوری ،کاک رەحمان خانی ،کاک مستەفای تەندروستی ،گوڵاڵە عزیز ومەهاباد سلێمان فەرمان وسەمیرەو فاتمە ،سەلام عەلی، تەلعەت سەعدوڵا بەرنامەی وەرزش،سیروان مام سلێمان ،ستافێك بەرنامەی مناڵانیان ئامادەوپێشکەش دەکرد: (مامۆستا ئیدریس، مامۆستا مەلا جاسم، لۆزان و سیڤەرعەلی حەمەسالەح، دابان و کارزان محەمەد، دونیاو میدیای مامۆستا نیزام کوێخا ،سەروەرو ئەڤین خوالێخۆشبوو مەحمود مراد علی، نەبەرد خوالێخۆش بوو فواد غەریب،مناڵەکانی برایمە سوور،هێرش وسنوورلالەحەمە سەنگەری ،ئازاد عوسمانی رادیۆی دەنگ ،کچی مامۆستا ستار،شیلان هەواس ...دواتر لە لایەن م.محەمەد سابیری لانەی مناڵانەوە ئامادەدەکرا وستافێ پێشکەشیان دەکرد)، ئیبراهیم قادر بەستافێکەوە ماوەیەك بەرنامەی خوێندکارانیان ئامادەو پێشکەش دەکرد .محەمەد حسێن بەرنامەی گەنجانی هەبوو .م.مستەفا سەعید بەرنامەی موزایکی هەبوو،ملازم نیازی هاتوچۆ ،بەرێزان:مەلا حەمە ئەمین و مەلا محەمەد و مەلا وەهاب و مەلا ئەمین..وتاری ئایینیان هەبووە ،خاتوو ئالاو خاتوو گێلاس بەرنامەی ژنان...زۆربەی رێکخراوە حکومی و(n.g.o) کان لە گەڵ فەرمانگەکانی حکومەتدا بەرنامەی هەفتانەیان هەبوو...

ئەم (کچ و ژنان)ە ،وەك کارمەند لە رادیۆ دامەزابوون ،کاری بێژەری و دەرهێنانیان دەکرد:.

(سۆیبە عوسمان ،خالدە مجید ،جوان ئیبراهیم باجلان ،بەناز خالد ،کۆیان هەژار ،خەبات ئیبراهیم ،سەرگوڵ کەریم ،هەرمێ نامبق ،هێرۆ عەبدوڵا، ساکار )

## رادیۆی دەنگی گەرمیان و رۆڵی ژن:..

لەسەروبەندی پاش راپەرین، بەشداری ژن لە کایە جیاوازەکاندا(مەبەستم لە دەرەوەی ماڵ)، زۆر کەم بوون،لەوەش کەمتر کاری حزبی ..چونکە هێشتا مابوو کۆمەڵگە قبوڵی ئەو بەشداریانە بکاو کچان و ژنان نەکەونە بەر تانەو توانج و رەخنەی بێبنەمای دابونەریتی دواکەوتوویی کۆمەڵگە..رادیۆی دەنگی گەرمیان توانی دەروازەیەك بۆ ژنان بخاتەسەرپشت ،ژینگەیەکی لەبار برەخسێنێ ،بۆ ئەوەی کاری تێدابکەن و،خۆیان لە خەم و ژان و ئازارو خواستەکانی خۆیان بدوێن،نەك پیاو.(کورد دەڵێ: نان بۆ نانەواو گۆشت بۆ قەساب ،یان دەستی کەس پشتی کەس ناخورێنێ..)سەرکەوتنەکەشیمان لەوەدابوو، هەموو وەك یەك خێزان کارمان دەکرد، باوەری تەواومان بە کارو کاریگەری میدیا هەبوو،شارەزایمان لە باری دەرونی و پەیوەندییە سیاسی



لای راستەوە،وەستاوەکان: سوییە عوسمان،جمیل محەمەد،سەلام عەلی،ئیبراهیم باجلان،بەناز خالد،حکیم حسێن،دانیشتوەکان:شێرکۆ فەقێ،خالیدە مجید،مەجید زیرەك،ئەحمەد محەمەد.

هەرچەندەكاری رێكخراوەی هێشتا لەسەرتادا بووچەند رێكخراوێك دامەزرابوون (ژنان ،مامۆستایان ،خوێندكاران..)،داوامان لێكردن ،بەرنامەیان لە رادیۆوە هەبێ ، لقی ژنان یەكێك بوو لەو رێكخراوانەی كە زووهاتنە دەم داواكاریەكەمانەوە و رۆڵی باشیان لە هوشیاركردنەوەی ژن و هێنانە دەرەوەی ئەو كچ و ژنانەی هەبووكە توانای خزمەتكردنیان هەبوو لەرێی میدیاوكاری رێكخراوەییەوە .. ئەوەیشی زیاتر بوە چاوساغ و هۆی سەركەوتنی ئەم رێكخراوە لە گەڵ (دەنگی گەرمیان )هاوكاری تەواوی كارمەندانی رادیۆ بوو بەتایبەت،(خالیدە مجید و بەناز خالد..)،چونكە خۆیان كارمەندبوون لە رادیۆ و ئەندامی كارای رێكخراوەكەش بوون..

## گۆرینی ناوی كارمەندەكان:

پاش پرۆسەی ئازادی عێراق(٢٠٠٥)، سیستمی رادیۆ كرایە(f .m) ، چەند كارمەندێكی تازەمان دامەزراند،چونكە بەشێ لە كارمەندەكان چوونە جێگاكانی دیكە بۆ كاركردن،ئەوەی مەبەستمە بیلێم ئەوەیە كە: ناوەی كارمەندە تازەكانمگۆری(بەندی بەرێوەبەری رادیۆبووم)،بەمجۆرە:

١-فایەق..كرایە...هێمن.
٢--محەمەد..كرایە..هەردی.



٣-عیماد..کرایە...هێدی.

٤- ئیبراهیم..کرایە...ئاری.





٥-سلطان کرایە...ساکار.

مەبەستم لەم ناوگۆرینە ئەوەبوو کە خزمەتی زمانی کوردی بکەین و واجوانترە کارمەندێ کە رۆژانە بەرنامە ئامادەو پێشکەش دەکا ، ناوێکی کوردی هەبێ..

ئەم گۆرانکارییە هێندە رۆچوو ،تەنانەت لە نێو خێزانەکانی خۆیشیاندا بەم ناوەوە بانگ دەکرێن..

## هەڵەی بێژەر:

ئەمە بەو مانایە نیە کە لە ماوەی ئەو (٢٠ساڵە) ی کاری رادیۆهەڵە نەکرابێ.بەڵکو دەیان هەڵەو سەهوی جۆراوجۆر دراونەتە بەر گوێی بیسەراندا ،دیارە کەم شانسی مامۆستا ئیبراهیمە یان لەوم رابینی هەڵەیەکی باس بکەم (بێگومان بۆچونی دووەممە )

ئێواران پەخشی عەرەبیمان هەبوو،(م.ئیبراهیم باجەلان و م.سەروەر فایەق و م.مریوان محەمەد ساڵەح و کاك حەکیم حسێن وجوان ئیبراهیم باجەڵان و بەنازخالد....)هەریەك بۆ ماوەیەك ئامادەکاری بەرنامەو هەواڵ و بێژەری ئەو بەشە بوون..ناونیشانی پەخشی رادیۆ (بەعەرەبی)بەم شێوەیە بوو :(هنا صوت گرمیان ،صوت مرکز تثقیم کرکوك ،للاتحاد وگنی الکردستانی..) مامۆستا برایم ووتی : (هنا صوت گرمیان ،صوت مرکز تدریب کرکوك ،للاتحاد وگنی الکردستانی..)

## چارەسەری کوتوپڕ:.

رۆژێ خاتوو سۆیبە عوسمان هەواڵەکانی دەخوێندەوە، دوا هەواڵ،هەواڵێکی تەندروستی بوو ،ئەو وتی :فەرمون لە گەڵ ئەم هەواڵە وەرزشییە، ئیتر وەستا.. لەو ساتە م.مشیر دەرهێنەربوو، رۆژنامەیەکی بەدەستەوەبوودەیخوێندەوە ،دەستوبر هەواڵێکی وەرزشی دایە،ئەویش ئاسایی خوێندیەوە بێ ئەوەی هەستی پێ بکرێ..

## کارمەندەکان و هەڵوێستمان:..

هەڵوێست وەرگرتن لە پێناو بیروباوەرو خزمەتی گشتیدا ،هەرگیزپەشیمانی بەدوایدا نایەت،چونکە مرۆڤ زۆر جار رۆحی خۆی بۆ دەخاتە گرەومەترسیەوە ،گومانی تێدانیە لە بەری دەچنێ ئەگەرزووبێ یان درەنگ، مەرج نییە ئەوبەرە (مادی) بێ،بەڵکو دەشێ رووسوری و سەربەرزی بێ..

رادیۆ بوە بەشێکی گرنگ لە ژیانمان ،ئاڵودەو پەیوەستی یەکتر بووبووین، چەشنی شوان و گۆچانمان لێ هاتبوو..کاتێ بەهۆی شەری ناوخۆوە بارو دۆخی سیاسی ،گۆرانێکی چاوەروان نەکراوی بە خۆوەبینی ،بەهەر هۆکارێك بێ سوپای عێراق هێنرایە سەر پەرلەمانی کوردستان،پاشان یەکێتی بریاری کشانەوەی بۆ سەرسنوورەکان دا ،ئێمەش وەك ئەوەی کە رادیۆ بووبووە بەشێکی ئەخلاقی و هەڵوێستی سیاسیمان بریارمان دا بە رادیۆوە بچینە سەرسنوور(تەواوی کارمەندان بە خێزانەوە..تەنها یەك برادەرمان نەبێ ئەویش بۆی نەگونجا..)،دواتر گەراینەوەو لەسەر بلۆك دادەنیشتین و بە هەمان جیهازی پەخش و کاسێتی سوردی(مەشخەڵان)، کەوتینەوە پەخش باشتر لە جاران..

دواتر ئەو هەڵوێستانەی ئێمە تەنها بۆ مێژووی ئەخلاقی سیاسیمان مایەوە،نەبووە مایەی پێزانینی حیزبی سیاسی،بە ئێستاشەوە بەری ئەو خزمەتە لە باخی گوێگرانمان دەچنینەوە نەك حیزب!..

## رادیۆ چی بە ئێمە بەخشی..

رادیۆ بۆ ئێمە بووبووە کایەیەکی گرنگی خزمەت و خۆرۆشنبیرکردن و پێگەیەکی جوانی کۆمەلایەتیش..کەمتر لە مانە (مادی)،چونکە ئەوەی وەرماندەگرت هەرگیز بەراورد نەدەکرا لە بەرامبەر ئەوەی کە دەمانبەخشی،بەخشینیش بۆ خەڵك لە کایە جیاوازەکانی ژیاندا مایەیی ئاسودیی و سەربەرزییە..

لە ژیانی رۆژانەدا زۆر جار رێکەوتی خەڵێکمان دەکرد،کە دەیزانی کارمەندی رادیۆین لە رادە بەدەر رێزو تقدیریان لێدەگرتین، لە شتکریندا هەوڵیان دەدا پارەمان لێوەنەگرن هیچ نەبا شتی باشیان دەداینێ و خاتریان دەگرتین،رۆژنەبوو کەسێ نەڵێ کرێکەت واسڵە(کرێی جێب)..

لەکاتی گرانییەکە(گەمارۆی ئابووری)،لە زەوی جوتیارێ بە دوو کووت کونجیم وەشاندبوو،چوم بۆ ئاودان، جلی کارکردنم لە بەربوو،جامانەیەکم پێچابوو لە سەرموو جوتێ پێلاوی(چوپلس)م لە پیابوو،ئاوم بری و خستمە سەر کونجییەکام، جوتیارێ لە خوار منەوە هات بۆ لام،تومەسئاوەکە بە دەستی ئەوەوە بووە ،کاتێ من بریبووم، (لە ژیانی کشتوکالیدا کارێکی گونجاو نییە،بێ پرس ئاوی کەسێکی دیکە ببڕی..)،مانوو نەوییەکی بە گلەیی کردو وتی :ئەرێ برا ئەو ئاوەت بۆ بڕی ؟! منیش بەو پەری ئەدەبەوە وتم :نەمزانی بە دەستی تۆوەیە،هاااا بەسەر چاو ئێستا بۆت بەرەو خواردەکەمەوە،خەریك بوو کەلەکە بشکێنم وتی :ئەتۆ بومستە بۆ خاتری خوا ئەم دەنگە هی رادیۆی گەرمیانە ،تۆ مامۆستا ئەحمەد نیت ؟! وتم :نەو..وتی بە کەلامی خوا ئەم دەنگە هی رادیۆی گرمیانە!.

داوای لێبوردنی کردو وتی :تۆباڵم وەملت پرسمەکەو هەرکە ئاو لای من بوو ،بیبە...

## وتاری ئایینی وهێلکەو رۆن:..

چەن مامۆستایەکی ئایینی بۆ وتاری هەینی و مانگی رەمەزانەکان بێ بەرامبەر هاوکارمان بوون..چونکە بەیانیان زوو دەهاتین ،ناچاربوین کارمەندەکان لە رادیۆ قاوەتی بکەین،( ماست و پەنیرونۆکاو و شلەی دۆینەو...)ئەمانە دەخوران..

رۆژێ مامۆستایەکی بەرێز پاش وتارەکەی هەینی هاتە ژووری ئیدارەو هێلکەو رۆن و چامان بۆ دانا ،بە دەممەتەقێوە وتی: بامەسەلێکتان بۆ باسکەم، ساحێو تراکتۆرێ جوتی بۆ جوتیارێ دەکرد،گاسنی ئاوەها دادەگرت، تا ئەژنۆ خۆڵی دەخست ،نیوەرۆ گۆشتی باشی بۆ دانابوو ،بۆ ژەمی دووهم رۆژ

هێلکەو رۆنی بۆ هێنابوو،سایەق دەموچاوی دابوو بە یەکداو وتبووی :حاجی من چاوەڕێی باشتر بووم ،کەچی تۆ هێلکەو رۆنت بۆ هێناوم ؟ !!

ئەویش وتبووی :قوروان جوتەکەی ئەمڕۆت هی هێلکەو ڕۆن بوو!..

مامۆستاش وتی :مامۆستا ئەحمەد مەعین وتاری ئەمڕۆم هی هێلکەو ڕۆن بوو ؟؟

## رادیۆ و جگەرەکێشان:.

بە ئێستاشەوەماڵیخۆم و باوك و خۆشك و براکانم جگەرکێشمان نییە،لەسەرەتای رادیۆوە لە بەرنامەی (شنەی بەیان) جارجارە بڕگەیەکمان هەبوو باسی خراپی و زیانەکنی جگەرەکێشانماندەکرد ،لەو ساتەی من ئەو برگەیەم دەخوێندەوە ،بەرەحمەت بێ (کاك ئەمین)دوکەڵیجگەرەکەی دەکردە سەروچاومدا،منیش دەمگوت :کوێگرانی بەرێز هاوکارم دوکەڵی جگەرەکەی دەکاتە سەرو چاوی منا چونکە پێی خۆشنییە باسی خراپی جگەرکێشان بکەم (بەرنامەکە راستەوخۆ بوو..)،زۆر جار بۆ دوابرگەی شنەی بەیان گۆرانییەکی (حەسەن زیرەك)ی ئامادە دەکرد،لە گەڵیا جگەرەیەکی دادەگیرسان و نزیك فلتەرەکەی بە زمان تەڕدەکرد و قوڵ مژی لێدەدا، منیش وەك ئەوەی بێئاگام لەو حاڵەی ئەو، دەستم دەبرد دەنگی رادیۆکەم کز دەکرد، یەکسەر تۆڕە دەبوو دەیگوت: بۆ وادەکەی ؟! ئاخر جگەرەکەم بە .....بخۆم..؟!

لەوکاتەی کە بووم بە بەرێوەبەری رادیۆ،بەنەرموونیانی بەکارمەندەکانم وت :تکایە جگەرە مەکێشن،بۆ ئەوەی رومان هەبێ ئامۆژگاری گوێگرانمان بکەین ،پەیمان بێ هەر برادەرێك یان میوانێك بێتە ئێرە پێی بڵێم جگەرە لە حەوشە بکێشێ..بۆیە هەندێ برادەر دەهاتنە سەردان یان بانگێشت دەکران بۆ بەرنامەیەك دەیانگوت :رادیۆ تەنها یەك عەیبەی هەیە ،ئەویش جگەرە کێشانی تیانییە،براو شاعیری هاورێمان (سالەح هەلاج)یەکێك بوو لەوانە..

## من وهەلاج و بەرنامەی سڵاو گەرمیان:

زۆر بوون ئەوانەی کە هەڵەو کەموکوڕییەکانی رادیۆیان پێ دەوتین..زۆر زیاتر بوون ئەوانەی کە دەستخۆشیان لێ دەکردین..هەلاج و خێزانی گویگرێکی دیاری ئەم بەرنامەیە بوون،وەك خۆی دەیگوت هەینی بۆ هەینی چاوەرێمان دەکرد..بەرنامەکە خۆم ئامادەو پێشکەشم دەکرد،گەرمیانیانە بوو،شیعری فلکلۆری و بەسەرهات وپیرەژن و پیرەپیاوم دواندن و راستەوخۆلە گەڵ شوانکارو جوتیارانداو هۆرە و گشت هەڵقەیەك میوانێکم هەبوو کە بەهرەیەکی هەبوایە چ لە ستۆدیۆ یان بە

تەلەفۆن دەمدواندن..هەلاج توشی قەلەقی کردبووم چونکە دەیگوت تۆ مامۆستای زمانی کوردیت ،حەیفە جارجار وشەی عەرەبی بەکار دەهێنی ،وام لێهاتبوو لە قسەکردندا زۆر بیرمکێدەکردەوە، جارجارە لە زمانم دەردەچوو،خەمدایدەگرتم ،راستەوخۆ دوای بەرنامەکا تێلی دەکرد و دەیگوت :ئەوە وشەی کوردی براوە ؟!

ئەمە بۆ من گرنگ بوو،منیش گرفتی خۆم هەبوو،برگەکانم بە زۆری باسوخۆاس و شیکاری و گێرانەوە بوو،من بیرم دەکردەوە بە زۆری گوێگرانی (سلاو گەرمیان)،بەتەمەن و نەخوێندەوارن ،ناکرێ بە کوردی پەتی بیاندوێنم یان بۆیان بدوێم..ئیتر لە نێوان من و هەلاجدا ئەم خەمە هەبوو (هەردوکمان خەمی زمانمان بوو..)،هەلاج دوای داخستنی رادێۆی گەرمیان،(٢٠١٢) رادیۆکەی پێچایەوە ،شەوێ چوینە ماڵیان وتی:لەوساوە ئەوە ئێستا رادیۆکەم هێنایەوە بۆ ئەوەی جام نەکا

،جارجارە دەیکەمەوە(٢٠١٨) بووا!..

## رادیۆی قیسارەو شوانێ:..

هێشتا رادیۆ (a.m) بوو،گوێگری زۆرمان هەبوو، تەنانەت زۆربەی شوانەکان رادیۆیەکی (قیسارە)یان پێبوو (سوک و بچوک هێندەی پاکەتێکی جگەرە دەبوو)،رۆژێ شوانێ رادیۆکەی خراپ دەبێ، بە ماڵەوە دەڵێ :ئەمرۆ تاکوئێوارە رادیوکەم بۆ نەبەنەشارو چاکینەکەن ،بە حەیانی حەی قەسەم سبەی دووپێم ناچێتە لای مەڕ!..

## پەیامنێرەکانی ڕادیۆ:..

چونکە خەرجیەکی وامان لەبەردەست نەبوو ،کارمەندمان نەبوو تایبەت بە کاری پەیامنێری،بەزۆری هەواڵ و دەنگوباسەکان لێرەو لە وێ دەمانبیست یان بە پێ سەردانی هەندێ لە فەرمانگەکانمان دەکرد،کە هێشتا لە رووی ئیدارییەوە زۆر لاوازبووین...

پاش ئەوەی کە رادیۆ بوو بە(f.m) و پەیوەندی دروست بوو بە هۆی تیلیفۆنی (نۆرماڵ)ەوە و دواتر مۆبایل،ئیتر کارئاسانی بوو،تەنانەت بۆ بەرنامە راستەوخۆکان و هەواڵی گەرموگوڕو..هتد

ئەوەی مەبەستمە زیاتر،لەم چەند ساڵەی دواییە، سودمان لە لادێ نیشینەکان بە تایبەت شوانەکان دەبینی، لە ڕێی مۆبایلەوە پەیوەندیمان لە گەڵ دەکردن و دەمانپرسی:

دەنگوباسی لادێ ،بەهارو پوش و پاوەن ،باران و خەلەو خەرمان ،سەرماو سۆڵە ،راوی ئاسك و ئاژەڵە كێوییەكان ،خواردنی رۆژانەتان بۆ لای مەڕ ،ئەمرۆ چەن مێتان زاو ،دۆمەڵان دەرچووە ،پەیوەندی نێوان لادێكان ،گللەیی و گازندەتان،داواكاری و پێشنیارتان ..هتد.؟؟

ئەم پەیوەندیانە راستەوخۆ بوون ،بۆ بەرنامەكان و ئەوەشی هەواڵی بوایە سودمان لێ دەبینی.،ئەوەی گرنگ بوو ،ئەم كارە تازە بوو، راستەوخۆو راستگۆیانەبوو، چونكە پێویست نەبوو شوانێ درۆمان بۆ بكا ،یان موبالەغەو ئارایشی هەواڵەكە بكا ،سادەو ساكار وەك ئەوەی دەیبینی بۆی دەگێراینەوە..

رۆژێ لە شوانێكم پرسی چی خواردنێكت لە گەڵ خۆت هێناوە ؟ وتی :موعەلەبات...رۆژێكی تر لە شوانێكی ترم پرسی رۆژانە ئاسك دەبینن ؟ دەست بە جێ وتی:مامۆستا هااها هاااا..ئەوە سێ چوارێكە بێترس دەلەوەرێن..!رۆژێكی دیكە پرسیم :قەت توشی گورگ بوون ؟ شوانێ وتی :بەلێ چەندین جار مەری خواردوین ،بەتایبەت لە رۆژە ساردو تەماوییەكاندا .!وتیشی رۆژێ لە سنوری ئێران (شوانی سنوری بەمۆ بوو) گورگێ كەوتە ناو رانەكەمان تەقەمان لێكرد و كوشتمان، بینیمان حەڵقەیەك لە گوێیەتی ژمارەی پێوەیە!..

تێبینی :ئەم بابەتە (رادیۆی دەنگی گەرمیان)،تەواو نەبووە و وردەكاری زۆری ماوە..زۆرێك كاریان تیاكردوە هێشتا ناویان نەهاتوە ..لە ئێستادا بمانبوورن...

ئەحمەد محەمەد قادر(ئەحمەدی ئیزاعە) ساڵی ١٩٦٦ لە كەلار –گردەگۆزینە لە دایك بووم پۆلی یەكەمی سەرەتاییم لە گوندی شێخلەنگەر خوێندوە ، باقی خوێندنم بە ئامادەییەوە لە كەلار خوێندوە ،ساڵی ١٩٩٢ زانكۆی بەغدا بەشی زمانی كوردیم تەواو كردوە،لە دەیەمەكان بووم، دەستەی دامەزرێنەری رادیۆی دەنگی گەرمیان بووم ،لە( ١٩٩٣تا ٢٠١٢) بەردەوام بووم ،سالی ١٩٩٣لە ئامادەیی پیشەیی كەلار وەك مامۆستای زمانی كوردی دامەزراوم ،تا ئێستاش بەردەوامم..

# مێژووی شوێنەوارەکانی کەلار و دەوروبەری

● محەمەد عەلی کەریم ـ شوێنەوارناس

شاری کەلار و دەورو بەری زیاتر لە هەفتا سایتی شوێنەواری هەیە کە بەشێکی زور لە سایتەکان تۆمار نەکراون. بەشێوەیەکی زۆر پوخت باس لە مێژووی کۆنی ئەو جوگرافیایە دەکەین کە ئێستا پێی دەوترێت قەزای کەلار، بابەتەکە ئاماژەیە بەچەندین قۆناغی جیاوازی ژیانی مرۆڤ و پاشماوەکانی لەناوچەکە، لە چاخەکانی هەزارەی شەشەمی پێش زایینەوە تاوەکو سەدەکانی حەڤدە و هەژدەیەمی زایینی.



هێلکاری ، محمد علی

کۆنترین مێژوی دەرکەوتنی ئاماژەکانی ژیانی مرۆڤ لە ناوچەکە، دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەی شەشەمی پێش زایین، دیارە دەنگونجێ کۆنتر لەم مێژووەش مرۆڤ لەم ناوچەیەدا ژیابێ، بەڵام ئێمە پشتمان بەبەڵگە زانستییەکان بەستووە کە ئەوانیش بەڵگە شوێنەوارییەکانە، بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان لە ساڵی ٢٠١٢ دا دوای دوو وەرز کاری کنەو پشکنین لە (گردی ڕەحیم) لەناحیەی ڕزگاری چەندین پاشماوەی شوێنەواری دۆزییەوە وەکو گڵێنەی جۆراوجۆر و بیناسازی تایبەت بە چاخی (حەلەف) ئەمەش دەرخەری ئەو راستیە کە پێشکەوتنی ژیان لە ناوچەکە هاوتا بووە لە گەڵ ناوچەکانی دەوروو بەر و هەمان هەنگاوی پیشکەوتنی ناوە ، جگە لە گرنگی دەرکەوتنی بیناسازی تایبەت بەچاخی (حەلەف)، چەندین شێواز لە نەخشی ڕەنگاوڕەنگ لەسەر گۆزەکان دۆزراونەتەوە لەگرنگترین ئەو نەخشانەش وێنەی چەند مرۆڤێکە لەسەر پارچە گۆزەیەك کێشراوەتەوە، مرۆڤەکان زیاتر لە ئافرەت دەچن، وێنەکە دیمەنی هەڵپەڕکێ نیشان دەدات ئەمەش دۆزینەوەیەکی گرنگە سەبارەت بە هەڵپەڕکێی کوردی، ئەم جۆرە لە هونەری وێنە کێشانی سەر گۆزەکان لەو سەردەمەدا پێمان دەڵێت مرۆڤەکان جگە

لە پەیدا کردنی گوزەرانی ژیانی ئاساییان گرنگیان بە داب و نەریت و رێورەسمەکانیش داوە، بەڵام ئەمە یەکەم دۆزینەوە نیە سەبارەت بەسەما و هەڵپەڕکێ یان رێورەسمە بە کومەلەکان، بەڵکو پێشتریش لەساڵی ١٩٦٠ لەگوندی (چۆغەمامی) لە ناحیەی (مەندەلی) چەند دیمەنێکی تری هەڵپەڕکێ دۆزراونەتەوە لەلایەن هەردوو شوێنەوارناسی ئینگلیزی (دیڤید و جۆن ئەنسی) ی هاوسەرییەوە، هەروەها لە ئێران لەگوندی (تەپە سیالك) جۆرێکیتر لە سەماو هەڵپەڕکێ لەسەر گۆزەکان دۆزراوەتەوە.

یەکێکیتر لەگرنگترین دۆزینەوەکان لەبواری شوێنەواردا دەرکەوتنی چەند گۆڕێك بوو لە گەڕەکی بەردەسووری سەروو کە چەند جۆرێك لە گڵێنەو کانزاو مووروی تێدا دۆزراوەتەوە کە مێژوەکانیان بۆ چاخی (جمد النصر ٣٠٠٠ ـ ٢٨٠٠) ساڵ پێش زایین دەگەڕێتەوە، ئەمەش قۆناغێکی گرنگی مێژوو دەردەخات لەڕووی ئاستی پێشکەوتن لەبواری پیشە دەستییەکان.

قۆناغێکی تری مێژویی لە گردی شێروانەوە دەستپێدەکات ئەمەش کنەو پشکنینی ساڵی ١٩٨٨ دەریخست کە چەند چینێکی مێژویی هەیە وەك لەچینەکانی خوارەوە شورایەکی بەهێز دەردەکەوێت لەگەڵ چەندین بەڵگەی تری شوێنەواری کە مێژوەکانیان دەگەڕێتەوە بۆماوەی نێوان سەدەکانی (١٨٠٠ ـ ١٦٠٠) پێش زایین، ئەمەو دەرکەوتنی گۆڕێك لەساڵی ٢٠١٢ کە چەندین گۆزەو کانزای لەگەڵ دۆزرایەوە مێژوەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ هەمان سەردەمی ئەو شورایە.

قۆناغێکی تر لە مێژوی ناوچەکە دۆزینەوەی ئەو پاشماوە شوێنەوارییانە بوو کە لە نمونەیەکی بچووکی گردەکەی ژێر بازاڕی سەنتەری شار دۆزرانەوە، پاشماوەکانیش خۆی لەچەندین جۆر گلێنەو بەردوو گۆڕ دەبینییەوە کە مێژوەکانیان دەگەڕێتەوە بۆماوەی نێوان سەدەکانی (١٦٠٠ ـ ١٤٠٠) پێش زایین، هەروەها لەگوندی (بەرلووت) لەیەك شوێن و لە دوو کاتی جیاوازدا دوو گۆڕی ژنو پیاوێك دۆزرانەوە،



مردووەکان لەتابوتی گلێنەی شێوە هێلکەیی نێژرابوون لەگەڵ چەندین پاشماوەی وەك کانزاو مووروو مۆری بەردین، کانزاکان بریتی بون لەجێ ئاوێنەو کلدانی ئافرەتان، هەرچی مۆرەکانیشە لەبەرد دروستکراونو چەند جۆرێك لەنەخشی ئەندازەییو ئاژەڵیان لەسەر هەڵکۆڵراوە، مێژوی ئەم گۆڕانە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٣٨ پێش زایین بۆ ٢٢٨ زایین)، لەلایەکیترەوە لەساڵی ٢٠١٥ دا لە گردی شێروانە گۆڕێکی تری هاوشێوە دەرکەوت کە چەند پارچە زێڕێکی شێوە سینەبەندی لەگەڵ نێژرابوو مێژوەکەشی هاوسەردەمە لەگەڵ دوو گۆڕەکەی گوندی بەرلووت،



لەهەمان گرد و لەساڵی ١٩٨٨ لەچینەکانی ناوەند چەندین پاشماوەی شوێنەواری دۆزرایەوە لەنموونەی گۆزەو کانزاو دراو و بیناسازی کە مێژوەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی نێوان (٤ ـ ٧) زایینی. لە باکوری قەزای کەلار شوێنەوارێکی گرنگ هەیە ئەویش شوێنەواری پەیکوڵیە کە دەکەوێتە گوندی بەرکەل لە لاپاڵی رۆژئاوای چیاکانی قەرەداغ، ئەم شوێنەوارە دەکەوێتە سنووری ناحیەی (پێباز - کەلار) بە دووری (٣٨کم). مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پادشای ساسانی نرسی (٢٩٣-٣٠٣ز) شوێنەوارەکە لە کۆندا پێکهاتووە لە چوارگۆشەیەك کە بە بەردی داتاشراوی ڕێك هەڵبەسترابوو پەیکەری دەم و چاوی پادشا نرسی بە شێوەی هەڵکۆڵینی دیاری نیوەبەرجەستە لە هەر چوار ئاراستەی شوێنەوارەکەدا هەبوو لە گەڵ چەند دێر لە نووسینی پەهلەوی.



بەڵام ئێستا تەنها بەشی ناوەوەی ئەم شوێنەوارە ماوە لە گەڵ کۆمەڵێك لە بەردی داتاشراوی سادە بە دەوروبەریدا، مەبەست لە دروستکردنی ئەم تاوەرەی پەیکولی ڕای جیاواز هەیە، هەندێك پێیان وایە ئاتەشگەدە بووە و هەندێکی تر پێیان وابوو کە گۆڕی یەکێك لە پادشایانی ساسانی بووە، بەڵام ئەوەی زیاتر ڕوونەو پسپۆڕان پشت ڕاستی دەکەنەوە کە شوێنەوارەکە دەگەڕێتەوە سەردەمی پادشای ساسانی نرسی کوڕی سابووری یەکەم، رای زۆرینەی شوێنەوارناسان لەسەر ئەوەیە کە پەیکولی وەك یادگارییەك بۆ تاج لەسەرنانی پادشا نرسی دورستکراوە، دوای ئەوەی لە کێبڕکێ و ناکۆکی و جەنگ لەگەڵ نەیارەکانیدا سەرکەوتنی بەدەستهێنا و تەختی شاهانەی بەدەستهێنا، بێگومان دەقە هەڵکەندراوەکانی پەیکولی بە وردی باس لە رووداو کێشەکانی ئەو کاتە دەکەن کە چۆن نرسی توانی

سەرکەوتن بەدەستبهێنێت، هەندێك شوێنەوارناس وای مەزەندە دەکەن کە هەر لە شوێنی پەیکوڵی پەیمان دراوە بە نرسی و تاجی شاهانەی کراوەتەسەر. شایەنی باسە لەدەقەکانی نرسی زۆر بە روونی ئاماژە بە "گەرمیانییەکان"دەکات و سوپاسی تایبەتیان دەکات کە چۆن پشتگیری پاشا نرسی بوون بۆ بەدەستهێنانی تەختی شاهانە .

لەکۆتایی سەدەی حەوتەمی زایین پرۆژەیەکی گرنگی ئاودێری لە کەلار دروستکرا، ئەمەیش ناسراوە بە (جۆگەی گاوری) ئەم کەنالە ئاماژەیەکی گرنگە لەبواری پشت بەستنی مرۆڤ بە کشتوکاڵەوە جگە لەوەش لایەنێکی دیکەی بیناسازی نیشان دەدات بەوەی توانراوە لە ئاستێکی بەرزی هونەریدا ئەم جۆگەیە دروست بکرێت، پرۆژەکە لە گەڕەکی (حەمەی کەریم) ی کۆنەوە دەستپێدەکات بەچەند قۆناغێك درێژدەبێتەوە تاوەکو گوندی (بان ئاسیاو). لەکاتی نۆژەنکردنەوەی بەشێك لەم کەنالە کورتە نەسراوێك دەدۆزرێتەوە کە ئامەژە بە رۆژی کردنەوەی پرۆژەکە دەکات.



سەبارەت بەسەدەکانی (٧ ـ ١٠) زایینی، بەڵگەی گرنکی شوێنەواری دۆزراونەتەوە گرنگترینیان ئەو پاشماوانەیە لەچینەکانی سەرەوەی گردی شێروانە دۆزراوەتەوە، لەسەدەکانی (١٠ ـ ١٥) زایینی بەڵگە شوێنەوارییەکان زۆر کەمن، بەڵام لێرە بەدواوە کۆمەڵێ بینای شوێنەواری و کەلەپوری لەکەلار و

دەوروبەری دروستکراوە، کۆنترینیان قوڵڵەکانی نێوان (کەلار ـ دەربەندیخان)ە، ئەم قوللانە پێکهاتوون لەدوو نهۆم، شێوەیەکی لولەکییان هەیە بۆ چاودێریکردنی بەشێك لەسنوری نێوان (عوسمانی ـ سەفەوی، قاجاری) لەکەناری ڕووباری سیروان و بهرزاییە کان دروستکراوە، قوڵڵەکان ژمارەیان زۆرە و لەگوندی بەدەرسووری خوارەوە دەستپێدەکات بەناوەکانی (قوڵڵە برنجی، ڕازیانە، وەلی خنکاو، مەلا، قوڵڵەسوتاو، سەید مەحمود، ئحتیات، جنە، قاپ شکێنە، لەواوان، بانی خان، ڕێویلە) مێژوەکانیان بەتەواوی ڕوون نییە بەڵام لەدوایین نۆژەنکردنەوە دراوێکی عوسمانی سەردەمی (سوڵتا عەبدولحەمیدی یەکەم ١٢٥٥ کۆچی ـ ١٨٣٩ زایینی) دۆزرایەوە، ئەمەش ئاماژەیەکە بۆئەوەی کە مێژوەکانیان لەو دراوە کۆنترن، هەروەها بینای باجگەی پەیکولی هەیە کە تاڕادەیەك نزیکە لە دوایین قوڵڵە (قوڵڵە ڕێویلە) و پێدەچێت مێژووەکەی بگەڕێتەوە بۆ هەمان سەردەم.




لەناوەندی قەزای کەلارو لەدەروازەی شار (قەڵای شێروانە) دەبینرێت کە یەکێکە لە بینا ناوازەو گرنگەکان لەسەر ئاستی بینا کەلەپوری‌و شوێنەوارییەکانی کوردستان، قەڵاکە پێکهاتووە لە دوو نهۆم‌و ژێرزەمینێك بەچەندین یەکەی بیناسازی گرنگ ڕازاوەتەوە، لەگەڵ چەندین نەخش‌و نیگاری قەشەنگ کە هەندێ بەشی قەڵاکەی پێ ڕازێنراوەتەوە، نەخشەکانیش بریتین لە دیمەنی ڕوەکی‌و ئاژەڵی‌و ئەندازەیی، مێژووی قەڵاکە بەپێی زۆر بەی سەرچاوەکان دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٨٦٦ ـ ١٨٧٤) کەلەسەر دەستی (محەمەد پاشای جاف) دروستکراوە.



باجگەی پەیكوڵیش یەكیكی لە بیناكانی سەدەی نۆزدەیەمی زاینی  دەكەوێتە نێوان گوندی پەیكوڵی و بەركەل، نزیكەی (٦٠ كیلۆمەتر) لە باكوری رۆژهەڵاتی شاری كەلارەوە دوورە،ئەم باجگەیە لە كۆتاییەكانی حكومڕانی عوسمانییەكان وەك شوێنێك بۆ وەرگرتنی باج لەو كاروان  و خێڵانەی بە ناوچەی پەیكوڵیدا تێپەریون دروستكراوە، هەروەها بۆ چاودێریكردنی سەلامەتی قافڵە بازرگانییەكان، شایەنی باسە لە سەردەمەكانی دواتریشدا ئەم بینایە وەك بنكەیەكی ئێشكگری پۆلیس بەكارهێندراوە.



لە گوندی (تازەدێ) و لەکەناری ڕووباری سیروان، کۆشکێکی ڕێك ئەندازە دەبینرێت، کۆشکەکە بریتیە لە سێ بەشی سەرەکی، پێکهاتووە لە دوو نهۆمو بەشی خزمەتگوزاریش دەکەوێتە بەرامبەرییەوە ئەم دوو بەشە بەپێی دوایین لێکۆڵینەوە دەردەکەوێت لەسەر دەستی (مەحمود پاشای کوڕی محەمەد پاشای جاف) ەوە دروستکراوە لەنێوان ساڵەکانی (١٨٧٤ - ١٨٨٢) هەرچی بەشەکەی تریشە پێشتر لەلایەن حەمە پاشای باوکییەوە دروستکراوە.



نزیکەی ١٠کم لە باکوری قەزاکەوە لە گوندی سەید خلیل، کومەلێك بینای ئارامگای ناوازە هەیە. بیناکان خویان لە دوشێواز دەبیننەوە وەك ئارامگای تاکە کەسی و ئارامگای خیزانی کە پیکدیێن لە لە زیاتر لە ژورێك، ڕووی سەرەوەیان بە پشتێن و گومەدی نیوە بازنەیی تەواوکراون . مێژووی ئارامگاکان دەگەرێنەوە بۆ کۆتایی سەدەی نوزدەیەم.



**محمد علی کریم**

**بەکالۆریۆس لە زانستی شوێنەوار  لە زانکۆی سلاحدین کۆلێژی ئاداب لە سالی   ٢٠٠٩**

**فەرمانبەر لە بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان لە هەمان ساڵ، سەرەتا وەك بەرپەرسی ڕاگەیاندن و پاشان ئەندامی لیژنەی پشکنین و پاشان وەك لێپرسیاری مۆزەخانەی شارستانی گەرمیان کاری کردووە**

# پێکهاتەی زمان لە کەلاردا



- پ.ی.د. دارا حەمید محەمەد

زمانی کوردی لە چوار زاری سەرەکی پێکهاتووە ، کە بریتین لە : (زاری ژووروو ، زاری ناوەڕاست ، زاری خواروو ، زاری گۆران ) ، زمان لە کەلاردا پێکهاتەیەکە ، نمونە و سامپڵی زاری ناوەڕاست و زاری خواروو زاری گۆرانی تێدایە ، فۆرمی گشتی ئەم پێکهاتەیە بن زارێکە ( sub Dialect)سەر بە شێوەزاری گەرمیان و شێوەزاری گەرمیانیش سەر بەر زاری ناوەڕاستە ، واتە زمان لە کەلاردا لە هەر فۆرمێکدا بێت بەشێکی زاری ناوەڕاست پێکدەهێنێت . بەپێی توێژینەوەکانی زمانناسانی وەك (محەمەد مەعروف ، کاتامبا Katamba ، رازمجوRazmajoo ، هدسن Hudsßn و چەندین زمانەوانیتر) هۆکارە سەرەکییەکانی دروستبونی زار و شێوەزار زیاتر سروشتی جوگرافی و هۆکاری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوری و بونیادنانی شار و شارستانییەتن ، نمونەی هەرە زیندو بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستییە بونیادنانی شاری سلێمانییە لە ساڵی ١٧٨٤ ، کە دانیشتوانەکەی کۆمەڵانێك بوون سەر بەزار و شێوە زارە جیاجیاکانی زمانی کوردی بەتایبەتی زارەکانی ناوەڕاست و گۆران ، دیاردەکانی کارلێکردن و ململانێ سروشتێکی ئاسایی زمان و زارن ، ئەو دیاردانەش واتە ململانێ و کارلێکردن دەبنە مایەی گۆڕان لەو زارو شێوەزارانەدا بەئاراستەی لێکتێگەیشتن و دواتر دروستبوونی شێوەزارێکی نوێ ، هەربۆیە دەبینین لەئەنجامی کارلێککردنی زاروشێوەزارەکانی ناوشاری سلێمانی ، شێوەزارێکی

تایبەت بەو شارە دروستبووە ، کە تایبەتمەندی فۆنۆلۆجی phonology (و مۆرفۆلۆجی morphology و سینتاکسی syntax سیمانتیکی semantics خۆی هەیە ، لە ئێستاشدا ئەو شێوەزارە بناغەیەکی پتەوی زمانی ستانداردی کوردییە . لەو سۆنگەیەوە گەر بڕوانینە زمان لەکەلاردا ، دەبینین ، تارادەیەکی زۆر ئەو هەلومەرجانەی بوونە هۆی دروستبوونی شێوەزاری سلێمانی لە کەلاریشدا ڕەخساون ، تەنها جیاوازی لەوەدایە ، کە شێوەزاری سلێمانی بەهۆکاری بونیادنانی شار هاتۆتەئاراوە کەچی شێوەزاری کەلار بەهۆکاری کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوری لە قۆناغی دروستبووندایە ، هەربۆیە دەکرێت ، بوترێت ، بەپێی پێوەرە زمانەوانییەکان و فاکتەرەکانی دروستبوونی زار و شێوەزار و ململانێی زارو شێوەزارەکان لە داهاتوویەکی نزیکدا لە کەلار شێوەزارێکی تایبەت بەشارەکە پەیدا دەبێت .

پێگەی جوگرافی کەلار ، کە لەلایەك سەنتەری ئیدارەی گەرمیانە و لەلایەکیتریش لەبەرئەوەی خاڵی بەیەکگەیشتنە لەگەڵ ناوەڕاست و خوارووی عێراقدا هەر لەسەرتای دروستبوونییەوە لە ساڵی ١٩٧٠ تا ئەمڕۆ هەمیشە پەناگەیەك بووە بۆ کوردانی خواروو ، کە بەهۆکاری سیاسی و هەڵاتن لە دەستی ڕێژێمەکانی عێراق و هۆکاری ڕاگواستن رووبانکردوەتە ئەم شارە ، هەروەها هاوسنووری لەگەڵ ئێراندا و بوونی زیاتر لە مەرزێك لەسنوورەکەدا ، وایکردووە ، کەلار ببێتە ناوەندێکی بازرگانی گرنگ ، ئەمەش بۆخۆی هۆکارێکە بۆئەوەی خەڵکی ناوچەجیاوازەکانی دەوروبەری کەلار رووی تێبکەن . بێگومان هەموو ئەم هۆکارانەی کۆکردنەوەی کۆمەڵانی جیاواز لە سەنتەری کەلاردا کاریگەری لەسەر زمانی ناوچەکە دەبێت و بەپێچەوانەشەوەڕاستە ، واتە کاریگەرییەکە دوولایەن و دووسەرەیە . دیارە ئەو هەموو هەلومەرج و گۆڕانکارییە لە زمانی کەلاردا زەمینەسازی بۆ دروستبوونی شێوەزارێکی تایبەت بە ناوچەکە زیاتر دەکەن .

پێکهاتەی زمان لە کەلاردا خاوەنی تایبەتمەندی دەنگسازی و وشەسازی و ڕستەسازی و واتاسازی خۆیەتی ، ئەو خەسڵەتانەی زمان لەکەلاردا زیاتر لە پێکهاتە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکەیەوە سەرچاوەیانگرتووە ، چونکە دانیشتوانی کەلار پێکهاتەیەکن لە هۆزەکانی : (جاف ، گەڵاڵی ، دەلۆ ، هەمەوەند ، ورمزیار ، زەنگەنە ، باجەڵان ، جمور ، کاکەیی ، کەڵهوڕ ، لەك ، لوڕ ، فەیلی ، زەهاوی ، گێژ ، تەرخانی ، شاتری ....تد)ئاشکرایشە کە زمانی ئاخاوتنی ئەم هۆزانە جیاوازن و چەند شێوەزارێکی هەریەك لە زارەکانی ناوەڕاست و خوارو و گۆران لەخۆدەگرن . ئەم تێکەڵەیە لە قسەپێکەران بە زار و شێوەزاری جیاواز لەئەنجامی پەیوەندی بەردەوام و ڕۆژنەیان کارلێکدەکەن و ئەنجام گۆڕان لە شێوەزارەکانیانداڕوودەدات ، وەك پێشتر ئاماژەمان بۆکرد کارلێك و گۆڕانکارییەکان بەئاراستەی دروستبوونی شێوەزارێکی نوێ و تایبەتن بە کەلار .

**ناوی تەواو : پرۆفیسۆری یاردەدەر د. دارا حەمید محەمەد**

**ساڵ و شوێنی لەدایكبوون : ١٩٦٦ كفری**

**شوێنی نیشتەجێبوون : كەلار گوندی ئەڵمانی ، بەردەسوور**

**بڵاوكراوە : ٢ كتێب بەناوەكانی (واتسازی ٢٠١٠ ) و (هەندێ لایەن لە تیۆرییەكانی زمان ٢٠١٣ ).**

**بەشداری زیاتر لە ١٢ كۆنفرانسی زانستی لە ناوەوە و دەرەوەی هەرێم كردووە**

**زیاتر لە ١٥ توێژینەوەی زانستی بڵاوكردووەتەوە.**

**سەرپەرشتی ٢ نامەی ماستەری كردووە**

**وەك سەرۆك وئەندامی لیژنەی گفتوگۆ بەشداری ٧ نامەی ماستەر و ١ نامەی دكتۆرای كردووە.**

**ئێستا مامۆستایە لەبەشی زمانی كوردی ، كۆلێجی پەروەردە ، زانكۆی گەرمیان .**

# مێژووی گەڕەکی سەرکەوتن



● مستەفا سەعید علی

گەڕەکی سەرکەوتن یەکێکە لە گەڕەکە گەورە و دێرینەکانی قەزای کەلار دەکەوێتە سەر ڕێگای سەرەکی کەلار ـ سلێمانی، هاوسنوورە لەگەڵا گەڕەکەکانی ( گۆران ـ گازینۆ ) لە باکور، ( سیروان ) لەرۆژهەڵات، ( شەهیدان ) لە ڕۆژئاوا و( فەرمانبەران ) لە باشور. تابەر لە ڕاپەڕین ناوی (مەجموعەی حەمەی کەریم) بوو بەڵام دوای ڕاپەڕین ناوی گۆڕدرا بۆ ( سەرکەوتن ) سەرەتای دروستبوونی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی١٩٧٦لەسەر ڕووبەری ٢٤١ دۆنم زەوی و بە چێوەی ٣١٢٩ مەتر. بە دروستکردنی (١٠٠) سەد خانوو بە شێوەیەکی ئەندازەی ڕێکوپێك، کە هەر خانوویەکی بریتیبوو لەدوو ژوورو هەیوانێك و چێشتخانەو حەمام و تەوالێتێك لەسەر ڕووبەری ١٨٠م٢ (١٢× ١٥ ) م ئەم سەد ماڵە لەلای خەڵکی گەرەکەکە ناسراوە بە خانووە سەبەکان، کە لە بەردوقسڵا دروستکرابوون و سەری بە کۆنکرێت گیرابوو، ئەم سەدماڵە لە بنەڕەتدا بۆ فەرمانبەرانی دەوڵەت دروستکرابوون بەڵام ئەو کوردانەی کەلە ساڵی١٩٧٥ دوورخرابوونەوە بۆ باشوری عێراق و لە ساڵی ١٩٧٧ گەڕێندرانەوە بۆ پارێزگای سلێمانی بەشێکی زۆریان هاتن لە شاری کەلار نیشتەجێ بوون و چوونە نێو ئەو خانووانە و حکومەتیش هیچ ڕێگرییەکی لێنەکردن. بەڵام بە تەواوی دروستکردنی گەڕەکەکە دەگەڕێتەوە بۆ نێوان ساڵانی ١٩٧٧ بۆ ١٩٧٩ کە بریتی بوو لە ٤٠٠ خانوو، هەریەکی بە ڕووبەری ٢٢٥م دووجا ( ١٥×١٥)مەتر دووجا بەڵام لە دوای ڕاپەرین شارەوانییەکانی کەلار یەك مەتری بۆ درێژی ئەم خانوانە زیادکردووە ڕووبەری هەر خانوویەك بووبە(١٥×١٦)مەتر کە دەکاتە (٢٤٠) م٢ . خانووەکانی بریتی بوون لە دووژووری (٥×٣ م )

و (٦X٤ م ) لەگەڵا چێشتخانەیەکی (٣X٣ م ) کەلە تەنیشت خانووە شەش مەتریەکەوە بوو لە گەڵا هەیوانێکی (٣X٩م ) لە کۆتایی بەرامبەر چێشتخانەکە دنگەیەکی چوارگۆشەی (٥٠X٥٠سم) کەلە بەرد و قسڵادرووستکرابوو. بەرزکرابووە بۆ ئەوەی سەری دووەمی شەڵمانی هەیوانەکەی بخرێتە سەر، لە ناوڕاستی هەیوانەکەشدا بۆرییەکی ئاسنی هە شت ئینجی درابوو بە ژێر شێلمانەکەدا وەك ڕاگری دووەم بۆ شێلمانەکە.

دەرگا و پەنجەرەی هەموو ماڵەکان بە ڕە نگی خۆڵەمێشی (رە ساسی) بۆیاخ کرابوون سەری خانوەکان بەدار گیرابوون بۆیە خەڵکەکە بەو خانوانەیان دەگووت ( خانوە دارەکان) بۆ ئەوەی خانووەکان دڵۆپەنەکەن ماڵەکان نایلۆنیان بە کار دەهێنا لە ژێرگڵا و قوڕیان دەدا بەسەر خانوەکانیاندا، کاری قوڕکاری لەم خانوانەدا بەهەرەوەزی بوو، هەر ڕۆژەو بۆ ماڵێك یان دوو ماڵ کاردەکرا هەرکەسەو کەس و کاری خۆی لە بانسواقدا یارمەتی یەکتریان دەدا.

زۆر جار کەسانێك کە لە سەربانی خانوەکەوە قوڕیان دەکێشا ئەو کەسانەیان دەدایە بە تۆپەڵە قوڕکە بە بەردەم ئەوماڵەدا ڕەتدەبوون بە تایبەت کاسانێك ناسیاوبونایە و بیانزانیبا دڵگران نابن. ئیتر کابراش کەدەیدیت جل و بەرگە تازەکەی دراوەتە قوڕەوە هەنێك توڕە دەبوو و هەنێك قسەی زبر و نەشیاوی بەوکەسە دەگووت کە قوڕەکەی وەشاندبوو، بەڵام سەرئەنجام لەو قسانە هیچ شین نەدەبوو و کابرا لێیدەداو دەرۆیشت و ئەمانیش لە دواوە دەستیان بە پێکەنین دەکرد، زۆر جار ژنانیش لەو هەرەوەزییەدا بەشداردەبوون ئەگەر بانسواقەکە تاقی بەیانیان بوایە نانی نیوەڕۆ لەماڵی خاوەن ماڵا دەخورا و ئەگەر دوایی نیوەڕوان بوایە ئەوا نانی ئێوارە تۆزێك بە زووەوە لەماڵی خاوەن ماڵا دەخورا.

زۆربەی ئەوانەی لە ساڵی ١٩٧٧ لە باشووری عێرق گەڕانەوە لەبەر نەبوونی جێگەو ڕێگە بەنیوەناتەواو گواستیانەوە نێو ئەم خانوانە.

دابەشکردنی خانوەکان بە دەستی قایمقام بوو کە "محەمەد مجید قادر - محەمەدی مجیدخان" بوو بۆیە هەرکەسێك ژمارەی خانوەکەی وەردەگرت خۆی دەچوو لە کۆگای کۆمپانیاکە ژمارەکەی پیشاندەدا و بە گوێرەی پێویستی خۆی دار و حەسیری بۆسەر گرتنی خانوەکە ی وەردەگرت. هیچ کام لە ماڵەکان سپی نەکرابوونەوە و لەساڵی ١٩٨١ هەمانشت لە بەرد و قسڵا حەمام و تەوالێت بۆ ماڵەکانی ئەم گەڕەکە دروستکرا، تەنانەت دیواری حەوشەش بۆ ماڵەکان دروستنەکراو خەڵکی دیواریان بە قامیش و گوێنی لە نێوان خۆیان و دراوسێکانیاندا دروستکرد.

زۆربەی ئەو ماڵانەی ئەم گەڕەکەیان ئاوەدان کردەوە بریتی بوون لە خەڵکی گوندەکانی قەزای خانەقین و هەردوو ناحیەی قۆرەتو و مەیدان، لەبەر ئەوەی قایمقامی ئەو کاتەی کەلار خۆی خەڵکی گوندی "مەحمود قەجەر" ی ناحیەی قۆرەتو بوو بۆیە زۆربەی خەڵکەکەی دەناسی و لەسەر بنەمای گوند و عەشیرەت خانوەکانی دابەشکرد. واتە هەر ڕیزە خانوویەکی پێکەوە دەدایە خەڵکی

گوندێك یان عەشیرەتێك زۆربەی دانیشتوانی ئەم گەڕەکە بریتیبوون لە عەشیرەتەکانی ( قادرمیروەیسی، باجەڵان، بێویانی، وەرمەزیار، جمور و تایشەیی).

بەڵێندەرەکەی پیاوێکی خەڵکی سلێمانی بوو بەناوی "حاجی حەسەن" کۆمەڵێك بەڵێندەری بچووکیش هەبوون لەم خانوانەدا کاریان دەکرد لەوانە ( حاجی مەجید جوامێر، عەبدوڵای مەلا کەریم، مەلا عەبدوڵا، نەریمان جانە موراد، کەمال سەمین علی، لەگەڵا کۆمەڵێك وەستادا لەوانە" ئەحمەد یاروەیس عەزیز، عەلی موراد یار موراد، عەلی عبدولڕەحیم ، وەلی عەلی جومعە، کەریم عەلی جومعە، خورشید محەمەد قادر، حوسین نەریمان، قادر نەریمان، عەبدوڵا خلیفە مالیك، عومەر محەمەد شەریف، مەحمود خاوەرە، ئەحمەد محەمەد عەزیزموراد) لەگەڵا کۆمەڵێك وەستای کفری و کەرکوکدا. من خۆم یەك هاوینی تەواو١٩٧٨ کرێکاریم لەو خانوانەدا کردووە و ئەو کەسانەم بە چاوی خۆم بینیوە کە بەڵێندەر و وەستا بوونە لە دروستکردنی ئەم گەڕەکەدا. دیارە کەسانی تر و وردە بەڵێندەر و وەستای تریش هەبوونە لەم خانوانەدا کاریان کردبێت بەڵام بۆ من ساغ نەبوونەوە کێن.

مەحمود محەمەد هەواس ناسراو بە ( مەحمو کوردی ) و قەجەر عەبدولکەریم و محەمەد حاجی قادر و عەلی حسێن هەواس و ئەوڕەحمان حاجی قادر بەتانکەر ئاویان بۆ وەستاو کرێکارەکان دەهێنا و لە بەرمیلیان دەکرد بۆ ئەوەی کارەکانیان نەوەستێت هەر وەستایەك چەن بەرمیلێکی لەلای کارەکەی دانابوو ڕۆژانە زیاتر لە جارێك ئاویان بۆ تێدەکردن. هەموو گەچی خانوەکانی ئەم گەڕەکە لە شاری فەلوجە دەهێنرا. لەگەڵا ئاوەدان بوونەوەی گەڕەکەکە دا لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٨ دوو بیری ئیرتوازی لێدرا یەکەمیان لە باشووری گەڕەکەکە، کە میراوەکەی ( موشەغیلەکەی) ئیبراهیم مەحمود فەتاح خەڵکی گوندی مەحمود قەجەر و ئەوی تریان لە دیوی باکوری گەڕەکەکە ، کە میراوەکەی "خەلیل کەریم فەرەج"خەڵکی گوندی کانی پەموو بوو. لەو بیرانەوە بەبۆری ئاو ڕاکێشرا بوو بۆ کۆڵانەکان و لەهەر کۆڵانێکدا دوو بۆ سێ تایپ دروستکرابوو کە بریتی بوو لە ستونێکی کۆنکریتی یەك مەتریی چوار گۆشە بە هەر چوارلایدا چوار بۆری نیو ئینجی لێبەسترابوو بۆ ئەوەی ماڵان ئاوی لێببەن لەبەر ئەوەی ئاوەکە ڕۆژانە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بەردەدرایەوە بۆیە زۆر جار ژنان لەسەر بەلوعەکان قەرەبالغیەکی زۆریان درووستدەکرد و بە زەحمەت دەیانتوانی مەنجەڵێك ئاویان دەستکەوێت. هەندێکجار ژنان لێیان دەبوو بە دەمەقاڵەو مەنجەڵا یان تەنەکە ئاوەکەیان دەکرد بەسەری یەکتردا و ژنە شەرمن و بێدەسەڵاتەکانیش بۆخۆیان بە مەنجەڵی بەتاڵەوە دەگەڕانەوە بۆیە ئەم جۆرە لە ئاوەدانە ماڵان چارەی کێشەی خەڵکەکەی نەکرد، ناچار خەڵکی بیریان کردەوە هەریەکەو لە حەوشەی خۆیدا بیرێکی دەستی لێدات کە لە ٢٠ بۆ٢٢ مەتر دەکەوتە ئاو.

لەبەر ئەوەی هێشتا کارەبا نەگەشتبوە ئەم گەڕەکە خەڵکەکە بە دۆڵکە و جەنجەڕ ئاویان لە بیرەکان هەڵدەگۆزی، بەڵام کە لە ١٩٧٩/٧/٢٣ بۆ یەکەم جار کارەبای نیشتمانی گەیەنرایە ئەم گەڕەکە، خەڵکی ئیتر وردەوردە ماتۆڕیان خستە بیرەکانیانەوە.

سەرەتا منداڵانی گەڕەك لەبەر نەبوونی بینای قوتابخانە لە سێ خانووی خانووە سەبەکان دەیانخوێند تالەساڵی ١٩٧٨ یەکەم بینای قوتابخانە دروستکرا لەسەر ڕووبەری (٤١٩٣،٩٧م٢ ) بەپانی ٦٢م درێژی ٩٢م . بەناوی ( مدرسە الشعلە الابتدائیە) پاشان ناوەکەی گۆڕدرا بۆ ( مدرسە النقال الابتدائیە) کەئێستا قوتابخانەی مرواری بنەڕەتییە. کەبریتی بوو لە قوتابخانەیەکی شەش پۆلی لە ئەسڵدا بۆ باخچەی ساوایان دروستکرابوو بەڵام کرایە قوتابخانەی سەرەتایی ، وساڵی ١٩٨٠-١٩٨١دەستکرابەخوێندن تێیدا و خوێندن تیایدا بە زمانی عەرەبی بوو یەکەم بەڕێوبەری مامۆستا "مەهتاو حەمە وهاب" بووە، یەکەم قوتابی لێوەرگیراوە (ئاسۆ محەمەد مستەفا) لە دایکبووی ساڵی ١٩٧٤ بووە. بەڵێندەرەکەی " حسن حاجی امین خچر" پیاوێکی تەڕ پۆشی کورتەباڵا، خەڵکی کفری بوو. بەشێك لەبینای قوتابخانەکە لە بەردی نەقاری بەشیوەیەکی جوان درووستکرابوو وەستاکانی خەڵکی سلێمانی بوون.

ئەو پیاوەی کارەباکەی راکێشا کوردێکی فەیلی خەڵکی بەغداد بوو بەناوی"حەیاوی" ئێمە کەمنداڵا بووین زۆرجار دەچووین لای دەوەستاین و دەمانبینی نەخشەیەکی گەورەی لەسەر ستاندێك دانابوو لەبەرامبەر خۆیدا و بەگوێرەی نەخشەکە بۆرییەکانی رادەکێشا و وایەرەکانی بەنێودا ڕادەکێشان. لەبەر کۆنی و نەشیاوی بیناکە بۆ قوتابخانە لەساڵی ٢٠١٤ ڕوخێنرا بۆ ئەوەی سەرلەنوێ بەدیزاینێکی تازە دروستبکرێتەوە بەڵام لەبەر ئەو قەیرانە ئابووریە سەختەی بەسەر کوردستاندا هات تائێستا ( ٢٠١٨) تەنها هەیکەلەکەی درووست کراوەتەوە.

مزگەوتی ئیمامی شافیعی یەکەم مزگەوت بوولە ساڵی ١٩٨٠ لەم گەڕەکە درووستکرا لەسەر ڕووبەری( ٨٠٦،٩م٢ ) کەپێکهاتووە لە حەرەمێکی گەورە و قاتی سەرەوەی حەرەمەکە تانیوەی دروستکراوە بۆ ژنان کەدەچیتەژوورەوە بۆ نێو حەرەم سێ دەرگای گەورەی ٢×٢ هەیە، دوانیان بە پەیژەیەکدا سەردەکەوی بۆ قاتی سەرەوە و دەرگای ناوڕاستیش ڕاستەوخۆ بۆ نێو حەرەم.

یەکەم ووتار خوێن لەم مزگەوتەدا مامۆستا مەلا سەید محەمەد عەلی حاجی بووە، دوای ئەو مەلا محەمەدی هۆرێنی ناسراو بە مەلا محەمەدی ڕیش هات. یەکەم خادیم و بانگدەریش مەلا محەمەدی شەل بوو قورئان خوێن و پێشنوێژیش هەریەك لە مامۆستایان مەلا سەید محەمەدعەلی حاجی و مەلا محەمەد مەحمود ناسراو بە مەلا محەمەدی تایشەیی بوون. تا ناوەڕاستی دووهەزارەکانیش ئەم مزگەوتە فەقێی هەبوو لە ئێستادا وتار خوێنی ئەم مزگەوتە مامۆستا مەلا کەریم فرج ناسراو بە مەلا کەریمی شافیعی و قورئان خوێنی مەلا ئەورەحمان محەمەد ئەمین و بانگدەریش محەمەد حەمید عەلی یە.

لە ڕۆژی شەممە ١٩٨٦/٥/٣١ کە ڕێکەوت بوو لەگەڵ یەکەم شەوی قەدری مانگی ڕەمەزاندا لەبەردەم دەرگای بچووکی ئەم مزگەوتە دا کارەساتێکی دڵتەزێن ڕوویدا و لەکاتی گەڕانەوەی خەڵکەکە لە مزگەوتەوە بۆ ماڵ بۆ پارشێو لەدەورووبەری کاتژمێری دووی شەو لەلایەن کەسێکی نەناسراوەوە

لەپشتەوە دەستدرێژی گوللەیان لێکراو زۆربەی ئەوانەی بەریکەوتن منداڵانی تەمەن نێوان ١١ بۆ ١٥ساڵا بوون و دەسبەجێ هەر لەوێدا سیانیان گیانیان لەدەست دا کە ئەمانە بوون ١ـ کامەران عزیز ٢ـ خەلیل ئەحمەد ٣ـ وریا حسن محەمەد هەواس.

هەشت کەسیش برینداربوون کە ئەمانەن بوون: ١ـ حەیدەر فەرەج محەمەد ساڵەح ٢ـ تاها حاجی محەمەد ٣ـ لوقمان عەبدولڕەحمان فەرەج ٤ـ سدیق ئیبراهیم ٥ـ مەجید عوسمان محمد ٦ـ جوامێر غەفور سەفەر ٧ـ ئەحمەد محەمەد سلێمان نەسور ٨ـ خەلیل رەشید مەحمود.

نەخۆشخانەی گشتی کەلار و نەخۆشخانەی فریاکەوتنی کەلار دەکەونە سنووری ئەم گەڕەکەوە، نەخۆشخانەی گشتی کەلار لەساڵی ١٩٨١ لەسەر ڕووبەری ١٦،٩،٦٦،٦٤م٢ بنیاتنراوە یەکەم پزیشك لەم نەخۆشخانەیە نەشتەرگەری ئەنجامداوە دکتۆر حەیدەر تاها عەلوەش بووە، لە ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١، بەڵام یەکەم دکتۆر لەم نەخۆشخانەیە لە نێو ساڵەدا نەشتەرگەری کردبێت دکتۆر جەبار عەبدول نەریمان بووە لەساڵی ١٩٩٤.

مزگەوتی دووەم لەم گەڕەکە لە ساڵی ٢٠٠٠ – ٢٠٠١ درووستکرا مزگەوتی "ئیمامی عەباس" بوو. لەسەر ڕووبەری ( ٢١٤٠/٦٢م٢) بەدرێژایی ٥٠×٤٣م. لەلایەن هەردووبرا هادی و مەهدی کوڕانی ئەورەحمان سەرچاخ، مزگەوتی ئیمام عەباس تەنیا مزگەوتە لەکەلار دا منارەی هەیە کە ٣٢ مەتر بەرزەو بەشێوەیەکی هەشت لای درووستکراوە لەچەند چینێکی بەشی سەرەوەیدا ناوەکانی (الله و محمد و چەند ئایەتێکی قورئان بە خەتی پلپ لەسەر کاشییەکی پیرۆزەیی نوسراوە لەسەری سەرەوەش بەگومبەتێکی سەوزی تێر کۆتایی دێت.

سەردەرگای گەورە و دەرگای حەرەم لەدەرەوە و شوێنی ووتاردانی مامۆستا بە چەند ئایەتێکی قورئان بەخەتی پلپو نوسخ و مێژووی دروستکردنی مزگەوتەکەو ئەو کەسانەی درووستیان کردووە بەخەتێکی جوان نوسراوە لە سەر کاشیەکانی پیرۆزەیی نەخش و نیگارێکی جوان بەدەوری نوسینەکاندا بەڕەنگێکی زەردی مت وەك چوارچێوەیەك نەخشێنراوە، هەموونوسینەکان لەنووسین و دیزاینی ئەندازیارێکی کەربەلاییە بەناوی "عبدالعقیم"،وەك لەبەشی خوارەوەی لای چەپی تابلۆکاندا دەردەکەوێت. مزگەوتەکە دوو دەرگای هەیە دەرگایی گەورە کەڕووی لە خۆرهەڵاتەو دەرگای بچووك کەڕووی لە خۆرئاوایەو دەکەوێتە بەرماڵەکانەوە. لەگەڵا هۆڵێکی پرسە کە نزیکەی ٢٠٠ کەس دەگرێت.

یەکەم مامۆستایی ووتار بێژ لەم مزگەوتەدا "مامۆستا مەلا فەقێ محمد غەیدان قادرـ ناسراو بو بە مەلا چاوڕەش" بوو (١٩٤٦ - ٢٠١٦) یەکەم بانگدەریش "مەلا ڕەحیم عەزیز محەمەد ( ١٩٣٥ـ٢٠١٦ ) بوو. ئیستا ووتاربێژی ئەم مزگەوتە" مامۆستا مەلا مەحمود محمد فرج ساڵح " و بانگدەریش "حسن حەمە علی ساڵحە"ە.

دووەم قوتابخانە لەم گەڕەکە ( قوتابخانەی پەژاری بنەڕەتی) بەناوی شاعیری شەهید " محەمەد پەژار"ەوە ناونراوە. شەهید محمد پەژار لە ڕاپەڕینەکەی ساڵی١٩٩١ لەلایەن موجاهیدنی

خەڵکەوە لەبەردەم نەخۆشخانەی گشتی کەلار شەهیدکرا کەچەن سەدمەترێك لەبینای قوتابخانەکەوە دوورە. یەکەم بەڕێوبەری ئەم قوتابخانەیە مامۆستا "ئەحمەد محەمەد کریم بەگ" بووە .

پرۆسەی زێرابکردن و قیرتاوکردنی شەقام و کۆڵانەکانی گەڕەکی سەرکەوتن لە ساڵی ٢٠٠٣ دەستی پێکرد ولەساڵی ٢٠٠٤ کۆتای هات بە ڕووبەری (٣٢٢،١٤٤،٥٥م٢). سێیەم بیری ئیرتوازی لەم گەڕەکەلە ساڵی ٢٠٠٧ لێدرا بە قوڵی ١١٦م لەلایەن سێ وەستای خەڵکی دووز خورماتوەوە بەناوەکانی ( فەرهاد نجم قادر ناسراو بە فەرهاد کۆفی ، ئەحمەد نجم قادر ، و حەمەد حوسین) وەستای دیوارەکەشی خورشید محەمەد قادر بوو، یەکەم دوو میراو لەسەر ئەم بیرە کاریان کردووە " سەلاح عەبدوڵا عەبدولڕەحیم و ئەحمەد محەمەد عەلی ساڵح" بوونە .

یەکەم خۆپیشاندان لە دژی ڕژێمی بەعس لە ساڵی١٩٨٤ لەم گەڕەکەوە دەستی پێکرد لە ئەنجامی تەقەکردن لەلایەن حیمایەکانی "شێخ جەعفەر شێخ عەبدولکەریم " ی پارێزگای ئەوکاتەی سلێمانی کە ئەورۆژە هاتبوونە کەلار دووکەس بەناوەکانی " جەلال تاهیر ئاغا" کە پیشەی فیتەر و لەدووکانەکەی خۆی دانشتبوو لەگەڵا "جومعە ڕۆستەم قادر" تەمەن ٢٩ساڵا خەڵکی گوندی محمودقەجەر شەهیدکران، خەڵکی شار تەرمەکەی شەهید جومعەیان بەسەر شان گەیاندەگۆڕستانی گوندی بەرلوت لە نۆ کیلۆمەتری ڕۆژهەڵاتی شاری کەلار. خوالێخۆشبوو"ئاسۆی مەحمود بەگی جاف" کە ئەو کاتە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق بوو لەپێشەوەی خەڵکەکەوەبوو.

یەکەم کێڵگەی پەلەوەر لەکەلار لەسنووری ئەم گەڕەکە دروستکراوە لە ساڵی ١٩٧٦ لەسەردەمی قایمقام " مەعاز ئیسماعیل حەقی" بەڵێندەرەکەشی " فەوزی عەبدولڕحمان بەگی دەلۆ" بووە وەستای دیوار و وەستای تەختەی لە سلێمانیەوە بۆ هێنراوە و توانای بەرهەمهێنانی ٤٥٠٠ مریشکی هەبووە.

سەنتەری گەنجانی کەلاریش کە فەرمانگەیەکی خزمەتگوزاری هونەرییە دەکەوێتە سنوری ئەم گەڕەکەوە .

باخچەی ساوایانی(ڕازاوە) یەکێکیترە لەو فەرمانگە حکومییانەی دەکەوێتە سنووری ئەم گەڕەکەوە لە ساڵی٢٠٠٧ لەسەر ڕووبەری ٢٥١٨،٨٢م٢ بە درێژی٧٥مX٦٢م دروستکراوە، یەکەم بەڕێوەبەری مامۆستا"سەرگوڵا سابر زۆراب"بووە.

**یەکەم تیپی وەرزشی لەم گەڕەکە لەساڵی١٩٧٩ دامەزراوە لەلایەن هەردوو یاریزان ئیبراهیم عەبدولڕەحمان و جەلال محێدین باپیرەوە بەناوی تیپی وەرزشی ئازادی "تیپی وەرزشی حەمەی کریم" یشیان پێوتووە یاریزانەکانی پێك هاتبوون لەم کەسانە:**

١ـئیبراهیم عەبدولڕەحمان ٢ـ جەلال محێدین باپیر ٣ـ یونس ئەحمەد محەمەد ٤ـ ئەحمەد کەریم خەیات ٥ـ نەوزاد فەرەج ئەمین ٦ـ یەحیا محەمەد سەعید ٧ـ محەمەد قادر فەتحوڵا ٨ـ ئەکرەم محەمەد عارف ٩ـ بەرزان حەمید ١٠ـ بارام مەحمود ١١ـ ئیبراهیم عەلی موراد ١٢ـ رزگار عوبدوڵا

(رزە ڕەش) ١٣ـ کامەران عەزیز حسێن ١٤ـ عەبدوڵا عەبدولکەریم محەمەد ١٥ـ هیوا ئیسماعیل رەشید ١٦ـ حامد خەلیل محەمەد.

فەرمانگەی ڤێرتێرنەری کەلار کەلە ساڵی ١٩٧٤ دامەزراوە و یەکەم کارمەندی " سەید یاسین عەبدوڵا" بووە دەکەوێتە سنوری ئەم گەڕەکەوە بەڕێوەبەری ئێستای دکتۆر عوسمان مستەفا حسێن"ە هەروەها فەرمانگەی شەتڵگەی کەلار و کۆگاکانی فەرمانگەی ئاوی کەلاریش لەگەڵا بەشێك لە شاری یاری کەلار دەکەونە سنووری ئەم گەڕەکەوە.

لەساڵی ١٩٨١ لەسەردەمی قایمقام محەمەد مەجید قادر (٧٧) دووکان بەیەکرێز لەسەر جادەی سەرەکی سلێمانی لەم گەڕەکە دابەشکراو هەر زوو ئاوەدان کرانەوە. یەکەم کەس لەم دووکانانەدا چایخانەی دانا " شەهابی کاکە ئەحمەد" بوو پاشان نزیکەی هەموو دووکانەکان بوون بە فیتەری و ڕۆنگۆڕی و چەن دووکانێکی نەبێت ووشکە فرۆش بوون، دوای دروستکردنی ناوچەی پیشەسازی کەلار هەموو ئەو فیتەر و پیشەوەرانە گواستیانەوە بۆ ناوچەی پیشەسازی و دووکانەکانیش ڕووخێنران و شوێنەکەیان کرا بە باخچەیەکی گەورە.

**چەندین ڕۆژنامەنووس و نووسەر و هونەرمەند و شاعیری شاری کەلار لەم گەڕەکە یا تا ئیستا نشتەجێن یان ساڵانێک لێی نیشتەجێ بوونە کە ئەمانەن.**

١ـ ڕۆژنامەنووس حامد محەمەد عەلی ـ کە دواتر بوو بە بەرپرسی کەناڵی سپَدە و سەرنووسەری ڕۆژنامەی یەکگرتوو و ساڵانێکیش سکرتێری سەندیکای ڕۆژنامەنوسانی کوردستان بوو.

٢ـ ڕۆژنامەنووس کاوە گەرمیانی ـ خاوەنی گۆڤاری ڕایەڵ ـ هەر لەم گەڕەکەدا لە شەوی ٢٠١٣/١٢/٥ تیرۆر کرا.

٣ـ ڕۆژنامەنووس کاروان یاروەیس .

٤ - ڕۆژنامەنووس دکتۆر "ئیبراهیم علی موراد.

٥ - ڕۆژنامەنووس ساڵح میروەیس.

٦ -ڕۆژنامەنووس ئیبراهیم سەمین عەلی.

٧ ـ ڕۆژنامەنووس بێستوون تەها باحەڵان

٨ـ ڕۆژنامەنووسی وەرزشی سامان یاروەیس

٩ـ ڕۆژنامەنووس پەیمان ئەمین سەمین

١٠ـ ڕۆژنامەنووس دلێر عەبدولڕەحمان ئەمین

١١ -ڕۆژنامەنووس سوعاد حاتەم ئەحمەد

-ڕاگەیاندکار کاروان عەلی عەبدولڕەحیم١٢

ـ ڕاگەیاندکار ئیبراهیم ئەحمەد هەواس١٣

ـ ڕاگەیاندکار هێمن قادر فەرەج١٤
ـ ڕاگەیاندکار ئیبراهم ئەحمەد ( ئاری )١٥.
١٦ـ هونەرمەندی تەشکیلی نامیق علی باباخان
١٧ـ هونەرمەند جەمال خەتات
١٨ـ هونەرمەندی گۆرانیبێژ : عوسمان عەبدولکەریم محەمەد
١٩ـ شانۆکاران ـ کامەران عەبدولڕەحمان ، حسێن عەبدوڵا عەزیز، دڵشاد ئەحمەد عەبدولڕەحیم، ڕەحمان عەلی ڕەمەزان.
٢٠ـ کچە شاعیر سارا مەجید
٢١ – شاعیری لاو دیار ڕەشید کەریم.
٢٢ـ شاعیر حەسەن سایەخان دارتاش
٢٣ـ شاعیری لاو حەمزە غوڵامی ( حەمزە ئەحمەد هەواس(
٢٤ـ نووسەر یاسین لەتیف قادر
٢٥ـ نووسەر و وەرگێڕ: مستەفا سەعید عەلی
٢٦ -فۆتۆگرافەر: حەیدەر نادر
٢٧ـ فۆتۆگرافەر: نیعمەت مەلۆ.
٢٨ – کامەران عەلی یارەویس شێوەکارو ڕۆژنامەوانی وەرزشی
هاوکات لەگەڵا ئەمانەدا کۆمەڵێك لاو لە کۆن و ئێستادا لە بواری وەرزشدا دەرکەوتوون و گەیشتونەتە

## ئاستی یانەکان لە کەلار و کوردستاندا لەوانە:

١ـ کامەران عەزیز حسێن ڕاهێنەری یانەی شێروانە لە ساڵی ١٩٩٥، و سکرتێری یانەی خانەقین لە نێوان ساڵانی ١٩٩٦ـ٢٠٠٣.
٢ـ عەلی شەهید محەمەد – سەرۆکی یانەی شێروانە.
٣ـ عوسمان ساڵەح ڕەبابە (عوسمان خانەقینی) یاریزانی یانەی شێروانە
٤ـ هونەری شەهید مەلاعەبدوڵا ، یاریزانی یانەی شێروانە و یانەی زاخۆ
٥ـ شێرزاد ئازاد ئەحمەد یاریزانی یانەی شێروانە
٦ـ شاهۆ ئازاد ئەحمەد یاریزانی یانەی شێروانە
٧ـ هەڵمەت عادل وەلی یاریزانی یانەی شێروانە و یانەی سلێمانی

٨ـ هۆشمەند جەبار گۆڵچی یانەی شێروانە
٩ـ سەردار مەجید حمید (دکتۆر سەردار) ڕاهێنەری یانەی شێروانە

١٠ـ خوالێخۆشبێت ستار محێدین باپیر(١٩٦٨ـ٢٠١٥) یەكێك بوو لەو وەرزشوانانەی ڕۆڵی بەرچاوی هەبوو لە پێشخستنی وەرزش لە شاری كەلار

١١ـ خوالێخۆشبێت ئاراس ئەحمەد ئیبراهیم یاریزانی یانەی شێروانە.

١٢ – سەردار مەحمود عەبدولمحەمەد.

١٣ – شێركۆ جەلال محەمەد یاریزانی یانەی خانەقین.

١٤ – هەڵۆ یاسین لەتیف یاریزانی یانەی دەربەندیخان.

١٥ - سیروان ئەمیر جاسم ـ یاریزانی یانەی شێروانە

١٦ – ئەكرەم رەحیم خوداداد یاریزانی یانەی شێروانە.

١٧ – عەدنان رەحیم خوداداد یاریزالنی یانەی شێروانەز

**تۆپی دەست:**

١ـ ئاكۆ جەوهەر علی برا بچوك یاریزانی تۆپی دەستی یانەی شێروانە.

٢ـ ماجد سلێمان محەمەد ( ماجدی مامۆستا سلێمان) یاریزانی تۆپی دەستی یانەی شێروانە و ڕزگاری

٣ـ ئومێد سلێمان محەمەد ( ئومێدی مامۆستا سلێمان) یاریزانی تۆپی دەستی یانەی شێروانە

**شەترنج:**

١ـ حەیدەر نامیق محەمەد سالح یاریزانی یانەی شێروانە

٢ـ نەوزاد فەرەج یاریزانی یانەی شێروانە

پاش گەڕان و ڕوپێویكرنێكی دوورۆژی بۆ ئەم گەڕەكە تابەڕواری ٢٠١٨/١/٢٠ جگە لە ماڵەكان ئەم دوكان و بازاڕانەش لەم گەڕەكەدا هەن:

١٠ دووكانی سەرتاشی.

٦ دەرمانخانە

١٢ دووكانی مریشك فرۆشی

٥ ماركێت

٢ دووكانی كارەبایی

٢ دووكانی ماسی برژاندن

٦ دووكانی كەمالیات

٤ مۆلیدەی ئەهلی كەكارەبا دەدەنە ماڵان، شایەنی باسە یەكەم كەس مولیدەی ئەهلی لەم گەڕەكە دانا "كەمال محەمەد فەرەج حسێن ناسراوە بە كەمالی معاون گبی "بوو مولیدەیەكی بیست ئەمپێری لەسەربانی خانوەكەی خۆی دانا وەك خۆی لە چاوپێكەوتنێكدا پێی وتم بە خۆڕایی كارەبای داوەتە چەند ماڵێكی دەورووبەر و دراوسێی.

٢١ جادە

٢٤ كۆڵان

٣ ساڵۆنی ژنان

٤ دووكانی كەمالیات

٢ فڕنی سەموونی حەجەری

٣ نانەوای

٣ دووكانی قەسابی

٤٢ دووكانی وردە فرۆشی

١ دووكانی بە كرێدانی چادر بۆ پرسە

١٠ باخچە

١ دووكانی سی دی

٢ دووكانی مۆبایل

١ دوكانی جامچی

٣ بورجی ئاسیا سێڵا

**سوپاس بۆ هەریەك لەم قوتابییە خۆشەویستانەم:**

**جێگر محەمەد عەزیز محەمەد**

**ڕێكەوت كەریم گوڵا محەمەد**

**یوسف ڕەحیم عەبدولكەریم**

**محەمەد ئیبراهیم ئیسماعیل**

**كەهاوكارم بوون لە كۆكردنەوەی داتاكان.**

**هەروەها سوپاسی زۆرم بۆهەریەك لە مامۆستایان:**

**یونس ئەحمەد مەحمود، كامەران یاروەیس عەزیز، كامەران عەزیز حسێن، كە بە سەرنج و تێبینییەكانیان بابەتەكەیان دەوڵەمەند كرد.**



# کەلار پێشەنگە!





- **نووسینی : ئیبراهم باجەڵان.**

کەلار لەبیرەوەریەکانی بەندەجێگایەکی زۆر فراوانی هەیە! چونکە ئەو بیرەوەریانە..... دەگەرێنۆ بۆ ساڵانێکی دوور و درێژ، و وەزۆر جیاواز- لە ڕاستیشدا ئەو ساڵانە کەمن لە کەلار ژیاوم زۆرترن لە ئەوانەی کە تیایاندا لە خانەقین ژیاومە.

هەروەکو لەبیرمە هەرجارێك کە گەردەلوول دەهات ئێمە لە شێرەوەن ئە مان ووت هەم لە کەلارەوە هێنای. لەو تەمەنەدا وەکو منداڵانی هەموو دوونیا حەزم لە جیهانێکی ئەفسانەی بوو _ کە گەردەلوولەکە بگەشتایەتە حەزم ئەکرد میرگکی (میرو ) شینم لابواییە، تابیدەمە دەمی گەردەلولەکە _ تا ئەویش هەڵم بگرێت بۆ شوێنێکی ئەفسانەی:

کاتێکیش گەردەلوولی زەمانە پێچامیەوە بۆ دەشتەکانی گەریلا _ کە پێگە جوگرافێکەی لە خواروی دەریاچەی ڕەزازەیە! چاوەروانی گەردەلولیك بووم. بمگەرێنێتەوە بۆ زێدی باو باپیرانم!

جاران خەڵکی وەکو ئەم سەردەمە لە هاویناندا ، بەندی ناو ژوورەکان نەبوون، بەڵکو لەسەر بان ئەنووستن ، بۆیە شەوانە خەیاڵمان لەگەڵا جریوەی ئەستێرەکان و لەگەڵا شەوق و گریی ئەو ڕۆشنایانە بوون، کە لەلای ئێمەوە دیاربوون!

لە باکورەوە چەن گڵو بەگی دێی کەلار و گرەگەورەکەی کەرکوك ئەبینران! وەلە خواریشەوە گڵۆپەکانی قەسریی شیرین!

و خانەقی و ئاگرەکەی بانمیل لە گەڵیانە چاوە حەشارەکیمان دەکرد!
لە گاڵتە جاریەکانی زەمانە کاتێك نشتە جێی کەلار بوین بە ئێمە مانیان ئەوت خانەقینییەکان! بەڵام لەدوای ڕووخاندنی ڕژێمی دیکتاتۆری ، گەڕانەوەمان جارێکی دیکە بۆ خانەقین، ئەوانەی کە لە تەمەندا بچووك بوون بە ئێمەیان دەووت کەلارییەکان.
هەوەها زۆر شتی دیکە هەیە بە درووشێوەی جیاواز ناویان دەهێنێ ! بۆوێنە:
مشکییە سەوز هەیە ، لە قەسریی شیرین و سەرپێڵی زوهاو!
بە مشکی ئەڵوەنی ناسراوە! چونکە داود بەگ جاف ئەیبەستە سەرەوە! من کاتێك ئەڵێم کەلار لەلام جێگەیەکی شیرینی هەیە ئەویش لەبەر چەند هۆیەکە . وەکو ئەوەی کاتێك سەردانی کەلار ئەکەم هەست بە خۆشەویستیەکی ڕاستە قینە دەکەم!
نەك تەنیا لەلایەنرۆشینبیران و خوێنەدەوارانەوە. بەڵکو لەلایەن خەڵکی نەخوێندەوارانەوە و خەڵکی بازاڕیشەوە هەست بەو دڵسۆزیە دەکەم!
بەڵام ئەوەش ناڵێم کە هەر هەموو خەڵکی کەلار بە و جۆرەن ، چونکە هەروەکو پێشینان ووتوویانە: چەم بێ چەقەڵا نابێ..
چەنجارێکیش لەلایەن چەند کەسانێکەوە بە ناهەق دژایەتی کراوم، بەڵام کاتێك هۆیەکەیم زانیوە دڵنیا بوومەلەوەی عەیبەکە لە کوێیە! حەز ئەکەم ئەوەشە بڵێم کەکاتێك باسی ئەو جۆرە دژایەتییە ئەکەم باسی ئەو کەسانە ئەکەم وەکو ئەوە باسی دەکەم_ ئەو کارانە دژ بە کەسێکی دیکە کرابێت و تەنیا بۆ خزمەتی مێژوو. دەنا سوپاس بۆخوا جێگەی هیچ ڕق و قینەیەك لە دڵما نابێتەوە!
وەکو نموونەیەك لە ئەو دژایەتیانە ، جارێکیان چومە ئیزگەی دەنگی گەرمیان ... لە دەرگاکە بووم _ لێپرسیاوێکی ئەو سەردەمە کەلەگەڵا تەکەتوبێکی بوو- کە دژایەتی خەڵکی خانەقییان ئەکرد و وەبە جەماعەتی خوالێ خۆشبوو جەبار فەرمانیان دوزانی: گوێم لێبوو بە ئەو کەسەی ووت: کە ئەرکە تارکردنم لە ئیزگەکە تارم بکەن!
ئەیووت ئەی کاك فڵان من چیبکەم کە ئەو - مەبەستی بەندەییە: ئەو دێتە سەر چۆبنی خۆیدا و خۆی لێ کەڕ دەکات :
ئیتر سەر سووڕمانم نەما - چونکە وەکو عارەب ئەڵێت: ازاغرف اسبب بگل العجب|
ئەگەر هۆکە زانرا سەر سوڕمانەکە نامێنێت:

زۆر شتی دیکە هەن کەماییەی شانازیمانن وەکو ئەوەی ، بەندە لەو ماوەیەدا سەرپشتیار پەیامنێر ڕۆژنامەی ( الاتماد ) بووم چەن شووین شتیکم دەسنیشان کرد بۆ جوانکردنی کەلار و زیاد کردنی ڕوپێوی سەوزایەکانی کەلار ، کە ئیستا بوونەتە هۆی ڕازانەوەی کەلار ، و جوانێتیەکەتی .!

بۆبە بیرِ هێنانەووەی کۆری ئەدەبی لە کەلار لە دەس پێشخەریی بەندەو محمەد زەهاوی بوو ـ لە نامیلکەکەی یادی شەهید محمەد پەژار باسی کراوە بۆیە لێرە درێژەی پێ نادەم. لە زۆربەی ئەو کۆمەڵە ئەدەبیی و رۆشینبیرانەم کردووە کە لە کەلار دامەزراوە. لە هەڵبژاردەکانیشدا دەنگی یەکەمم هێناوە ـ هەر لە کەلار کوری سەر چلەی نووسەری کوردی ناسراو مامۆستا عبدالمجید لوتفی م لە هۆڵی هونەرمەندان ئەنجاماندا بەدەس پێچەری کاك شیروان شیرەوەندی ـ لە ئەنجامی ئەم باسانەدا ئەتوانم بلِێم خەڵکی کەلار مەبەستم زۆربەیانە ـ حەز لە شتی نوێ دەکەن ـ لە هەمووکاتێکیشدا،

زۆر جار تەگرف (زیادە رەوی دەکەن) کەباسی ساڵانی رابردووی خۆم دەکەم لە کەلار پێویستە باسی کفریش بکەم چونکە هەرجارێك بیری خانەقین ـم بکردبایە سەردانی کفریم دەکرد چونکە ائێر تاق و کۆڵانە کۆنەکان و ـ نزیك بوون لە کوچەو کۆڵانەکانە کۆنەکانی خانەقی.

لەو رۆژانەی کە هێرش کرا ـ بۆ سەر رژێمی دیکتاتۆری ـ تیمەکەی ئێمە بۆ دوابەچونی ـ عەمەلیاتەکان پێك هاتبوو لە ئەم برادەرانە ـ خوالێخۆشبوو ئەمین ساڵح و خوالێ خۆشبوو ئەحمەد شیخ لەنگەری لە گەڵمانبوو جگە لە کاروان پارەوەیسی لەبیرمە ئەچووینە بەرزایەکانی ( کەنی زەرد) و سەیری خانەقیمان لە دوورەوە ئەکرد . لە دوایی رووخانی رژێم دووەم ئۆتومبیل بووین چووینە ناو شاری خانەقینەوە نەوە. هەروەها لەبیرمە پێش کۆچە دواییی خوالێ خۆشبوو ئەمین ساڵح بە ماوەیکی کەم لە کۆڵان مزگەوتەکە هاتە پیریمەوە خولکمی کرد بۆ نان خواردن . لە ماڵی خۆیان سوپاسیم کرد ووتم: ناتوانم بێم

پێویستە بگەرێمەوە بۆ ماڵا ، ئەویش بە پێکەنینەوە ووتی: ئێوە خەڵکی خانەقینن لەماڵا خۆتان ئەترسن.
ئیتر باسەکان زۆرن و بیرەوەریەکان فراوانن و چرِن بەڵام وەکو ئەڵێن مشتێك نموونەی خەرمانێکە ـ بەڵام بە هەرحاڵا لە هەموو حاڵێکە کەلار لە ناخمە و بیرەوەریەکان زیندوون....

وتاکو ئیستاش زۆربەی وۆری هاورێکانم هەر لە کەلارن ـ پێویستە سوپاسی مامۆستا ئەحمەدی ئزگە بکەم کە داوای لیکردم هەندێك لەو بیرەوەریانە تۆمار بکەم ـ ئیتر کەلار هەر ئاوەدان بێت وەکو بوو ـ ولێیان ناشارمەوە پێشبینی ئەوەمان کرد لە پاش نەمانی رژێم کەلار وەکو خۆی نەمێنێت ـ بە لام بە پێچەوانەوە حمد ( رزگاریش) وەکو خۆیی مایەوە ـ هەر جارێکیش بیری ئەو رۆژانە دەکەم ـ موبایل بو ماموستا عبدڵا حەسەن و ساڵح هەلاج دەکەم . لەگەڵا برادەرانی دیکە.

داوایی لێبوردنیش لە هاوەڵانی دیکە دەکەم ـ چونکە زۆرن ئەگەر ناوی هەموویانم بهێنایە لە چەن لاپەرِەیەکی دیکە جێگەیان ئەبووەوە. ئیتر یادی کەلار هەرهەموویان بەخێر. کەلار ئاوەدان و ئاوەدانیش سەلامەت.

کەلار لەبیرمە کاتێك

تیچکۆشەری ناسراوی کورد هەڤاڵا محمەد ڕۆف شەوکەت ئاغا نادریی شوێنمە کاتێك یەکترمان بینی ووتی: لە مێژوو وەکو نووسەرێکی دیاری ناونم ئەزانی ئەوە ئیستا یەکترمان بینی.

بەسەرهاتی ژیانم:

ناوی تەواوم ئیبراهم محمەد ئەمین کریم ئسماعیل مەحلان ـ باجەڵان

لە پایزی ساڵی ١٩٤٤ دایکم لەکاتی کۆکردنەوەی گەنمەشامی زووڕات پایزە، واتە لە دەورووبەری مانگی تشرینی یەکەم ـ دووەمـ هەر ناو کیڵگەکە ژان دەیگری و دەگەڕێتەوە بۆماڵا لەسەر دیستی دارا بێزار خوشکی مەلانە ئەحمەدی زاری لە دایك بووم ـ بەڵام بە بێدەنگی بە پێچەوانە منداڵانی دیکە. بەڵام دایکم لە خانەقی دا چاوی بە حاڵتێکی ئەواوهاکەوتبوو. کەمانی گەرمیانیان نابوو باندەمی منداڵەکە بەندەش بە جۆرە دەنگم بەرزەوە دەبێت

تەمەنم کەمتر لە شەش مانگان دەبێت کاتێك باوکم لەپاش عەمەلیاتێکی سەرنەکەوتووی ـ گورچیلەـ کۆچی دوایی دەکات بەڵام دادام زۆربە نازداری پەروەردەم دەکات، چونکە شەریکە موڵکی ئاغای دییەکەمان بووین. بەڵام ئەم نازدارییە تاسەر نەبوو، لە تەمەنی پێنچ ساڵیدا دادایشم ماڵئاوای لە ژیان دەکات پوریشم کەماڵی لە شاری خانەقین بوو منی برد بۆلای خۆی لە قوتابخانەی ( الشقمان ) ناونووسی کردم لەو سەردەمەی خوێندن بە زمانی عەرەبی بوو بەندەش تەقەی سەرم ئەهات لەو زمانە بۆیە یەکەم ساڵا کەوتم و ڕابەری پۆلەکەمان ناوی شێخ موسابوو. بە پوورم ئەیووت ئەم وەحشیەت لە کوێ بۆ من هێناوە. پاشان پاشان کە فێری زمان بوو هەمووساڵێك بە پلەی باش قۆناغەکانی خوێندنم ئەبری.

تاکو ساڵی ١٩٦١ـ١٩٦٢ کاتێك پەخشی ناوەندی حەوت ئامادەی خانەقین ، دەرچووم لە ساڵی ١٩٦١ـ١٩٦٢ بە هۆی چالاکی سپاسەوە ئەمری گرتنم بۆ دەرچوو پەنام بۆ لادێ برد لە دێی شێرەوەن ژیام . تاکو لە پاش رۆخاندنی ڕژێم حەرەس گەڕامەوە بۆ شاری خانەقین و کتێبخانەی (الشقانە) کردەوە بە شێوەی رەسمی و بەکوردیش ناوەکەی ( تێگەیشتن ) نووسیبوو بە خەتی حاجی خلیل زەهاوی شەهید

لەو ماوەدا بەرهەمی ئەدەبی و نووسینم بۆ گۆڤار و ڕۆژنامەکانی بەغدا ڕەوانە ئەکرد زۆربەیان بڵاو دەکرانەوە . پاشان بە هاندانی دۆستی میلەتەکان خوالێ خۆشبوو محمود الصبتە، و محمود البصتە بەرهەمەکانم بڵاو کردەوە. تاکو ساڵانی ١٩٦٧ لە ئەنجامی تاقیکردنەوەیەك لە بەعقوبە. بە پلەی یەکەم بە دەس هێنا و لە شارەوانی خانەقین بە ناونیشانی عەداد دامەزرام. و بۆ ڕۆژنامەو گۆڤارەکان ووتار و بابەتم نەنووسی .

بۆیە لە ساڵی ١٩٧٥ کاتێك دەسکرا بە تەعریب کردنی شارەکانمان ـ سەرۆکی شارەوانی ناردییە شوێنمەو داوای ل]کردم واز لەبڵاو کردنەوە ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بێنم دەنا ئەنجامی خراپ دەبێت. کاتێك بە قسەیم نەکرد یەکەم جار بۆ شارەبان دواتر بۆ کەربەلا لە ئاخروتوخری ساڵی ١٩٧٥ تاکو ساڵی ١٩٨٣ لە کەربەلا مامەوە. پاشان لە ساڵی ٢٠٠٣ بۆ سلێمانی و لە سلێمانیشەوە بۆ کەلار کە تاکو ٢٠١٣ تیایدامامەوە.

تاکو ٢٠٠٣ ز و چەندین کتێب بڵاو کرانەوە و چەندین کتێب و نامیلکەم هەیە ئومێدەوارم مەرگ مۆڵەتم بدات جیایان بکەم

**لە بەرهەمە بڵاو کراوەکانم:**

١ـ بەشێك لە دیوانی شێخ باباعلی بیندار بەهاوبەشی لەگەڵا چەند برادەرێك

٢ـ هەڵبژاردەیەك لە فلۆکلۆری ناوچەی گەرمان بە هاوبەشی نووسەر چەردەویڵا کاکەی

چوار کتێب لە سەر بەرهەم و ژیانی نوسەری کورد، خالقی عبدلمجید وتنی

١ ـالمؤلفات(الكاملة )

٢ـ ماكتب عن عبدالمجيد لطفي

٣ـ كوردستا بينات عبدالمجيد لطفي

٤ـ اللولوشعب زاكروس الاول ـ لەلایەن کومەلەی روناکبیری ارتیشادە بلاوکرایەوە

٤ـ زیاترلە کتێب و نامیلکەی جۆراو جۆر چاوەڕێی چاپکردن و بڵاو کردنەوەن

# دەربارەی کشتوکاڵ لە قەزای کەلار و دەورووبەری



• ڕەحیم حەمید عبدولکریم ئەندازیاری کشتوکاڵی

### یەکەم: لە ڕووی کارگێڕیوە

دوای ئەوەی کەلار بە مەر سومێکی کۆماری لە١٩٧٠/٢/٢٨ کرا بە قەزا، دوای ئەوە و لە ساڵی ١٩٧١دا فەرمانگەی (تێبینەرایەتی کشتوکاڵی کەلار) تێدا کرایەوە، و لە ساڵی ١٩٧٥ ناوی ئەو فەرمانگەیە گۆڕدرا بەسەردا هات و بووە (لقی ناوچەی کشتوکاڵی کەلار) و لە ساڵی ١٩٨٠ ئەو ناوە گۆڕدرا و بووە (لقی دەستەی کشتوکاڵی کەلار) و لە ساڵی ١٩٨٨ ئەو ناوە دیسان گۆڕانکاری بە سەردا هاتووە و بۆتە (لقی کشتووکاڵی کەلار) و سەربە سلێمانی بووە، دوای درووستبوونی حکومەتی هەرێمی کوردستان خرایە سەر بەڕێوبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی کەرکوك و سەر بەو ئیدارەیەبوو کە حکومەتی هەرێم لە دەربەندیخان بۆ کەرکوکی دانابوو، و لە ٢٠٠٥/٤/١٤ بەڕێوبەرایەتیەك لە کەلار دامەزرا بەناوی بەڕێوبەرایەتی کشتوکاڵی گەرمیان سەر بە بەڕێوبەرایەتی گشتیی کشتوکاڵی کەرکوك و لقە کشتوکاڵیەکانی کەلار و کفری و قۆرەتوو و مەیدان و دەربەندیخان وویستگەی باخی کەلاری لە خۆ دەگرت بەو شێوەیە مایەوە تاوەکو بەڕواری ٢٠٠٩/٢/٢ ئەو کاتە و بە پێی فەرمانی وەزاری (ژمارە ٦١٥ لە ٢٠٠٩/١/١٩)بوو بە بەڕێوبەرایەتی کشتوکاڵی کەلار و تاکو ئێستا هەر بەو ناوە ماوەتەوە، بەڵام بەڕێوبەرایەتی کشتوکاڵی کەرکوك بە فەرمانی وەزارەتی کشتوکاڵا بە ژمارە ٩٩٦١ل ٢٠٠٨/١٠/٦ ناوەکەی گۆڕدرا و بووە بەڕێوبەرایەتی کشتوکاڵی گەرمیان و بەڕێوبەرایەتێکەی گەرمیان هەڵوەشایەوە و بووبە

بەڕێوبەرایەتی کشتووکاڵی کەلار و لقی کشتوکاڵی کفریش کرا بە بەڕێوبەرایەتی، و بەڕێوبەرایەتیەکی نوێ بە ناوی بەڕێوبەرایەتی کشتوکاڵی خانەقین دامەزرا و هەموویان سەربە بەڕێوبەرایەتی گەرمیان بوون و ئەویش لە ناوڕاستی مانگی ٢ ی ساڵی ٢٠٠٩ گواسترایەوە بۆشاری کەلار. ناوی لێپرسراوەکانی فەرمانگە کشتووکاڵییەکانی کەلار لە ڕۆژی دامەزراندنیەوە

| ژ | ماوە | ناوی لێپرساوی فەرمانگە |
|---|---|---|
| ١ | ١٩٧١ـ١٩٧٥أ | ماجد محمد |
| ٢ | ١٩٧٥ـ١٩٨٢ | بهاء ألدين مجيد على |
| ٣ | ١٩٨٢ـ١٩٨٣ | عدنان زيدان |
| ٤ | ١٩٨٣ـ١٩٨٣ | چالاك محى الدين |
| ٥ | ١٩٨٤ـ١٩٨٥ | أحمد حەمەخان |
| ٦ | ١٩٨٥ـ١٩٩٥ | جلال كاكه عبدلله |
| ٧ | ١٩٩٥ـ٢٠٠٢ | ميكائيل ابراهيم |
| ٨ | ٢٠٠٢ـ٢٠١٢ | ستار على أوتاق |
| ٩ | ٢٠١٢ـ٢٠١٣ | محمد بابا رسول |
| ١٠ | ٢٠١٣ | غريب مولود |

## دووەم: دامەزراوە حکومیەکان:

١ـ یەکەمین بینا بۆ تێبینەراتیی کشتوکاڵی کەلار دروستکرا ، کەوتبووە نزیك بینای قایمقامێتی قەزای کەلاری ئیستا و دواتر فەرمانگەی کارەبای تێچوو، دواتر فەرمانگەی کشتوکاڵی کەلار گواسترایەوە بۆ بینایەکی نزیك بینای بە ڕیوبەرایەتی کشتوکاڵی کەلاری ئێستا بە ئاراستە بارگای حزبی شیوعی ئیستا، و بۆ ماوەیەکیش بەشی ڤێرتەرنەری کەلاری تێدابووە لە ساڵی ٢٠١١ و لەبەر کۆنی بیناکە لەلایەن شارەوانییەکانی کەلارەوە ڕوخێنرا.

٢ـ بینای ئێستای بە ڕیوبەرایەتی کشتوکاڵی کەلار، و پێشتر ئەو بینایە بۆ نیشتە جێبوونی فەرمانبەرە سەڵتەکان دروستکرا بوو.

٣ـلە ساڵی١٩٨١ویستگەی باخی كەلار لەسەر ڕووبەری ٢٧٥ دۆنم دامەزرا و دەكەوێتە سەر ڕێگای گشتی كەلار ـ گردەگۆزینە بەلای ڕاستیدا، هەروەها بینایەك و چەند كابینەیەك بۆ ئیدارەدانی ئەو ویستگەیە دروستكرا و لەلای چەپی جادەكەوە باخێكی ٦٠ دۆنمی (زەیتون) چێنرا، و باخێكی تری (قۆخ) لەلای ڕاستی جادەكەوە دروستكرا و هەروەها نەمامگەیەكی باخداریش لەتەنیشت باخی قۆخەكەوە دروستكرا، ئەو باخە قۆخە بەرهەمێكی باشی هەبوو بەڵام لە ساڵی ١٩٩٢ درەختەكان تووشی مێروو (كونكەری قەدـ قەدسمە) بوون و بەو هۆیەوە هەموویان لادران.

٤ـ پرۆژەیەكی ئاودرێری دروستكرا بۆ ئاودێری كردنی ویستگەی باخی كەلار بریتی بو لە هەڵدانی ئاو لە ڕووباری سیروانەوە لە ڕێگای ٣ ترۆمپای گەورەوە لە نزیك بازاڕدا بەرەو چەمی سیروان دانرابوون و بینایەكی بۆ كرابوو و لەگەڵا جۆگەڵەیەكی كۆنكریتی ئاودێری بەلای فلكەی ئاسكەكەدا تێدەپەڕی و بە نێو بازاڕدا دەڕۆشت كە پێی دەوترێت (مەشروعەكە) و ئێستا بۆتە بازاڕێكی داپۆشراو تاوەكو دەگەیشتە ویستگەی باخی كەلار، دواتر ئەو پرۆژەیە لە كار كەوت و پەنا بۆ لێدانی بیری ئیرتوازی برا بۆ ئاودێری كردنی باخەكان. و ترۆمپاكان لە لایەن حكومەتەوە فرۆشران.

٥ـ لە ساڵی ١٩٧٩ ڕووبەری ٦٠ دۆنم لە لایەن حكومەتەوە كرا بە بەرژینی سەر ڕێگای كەلارـ دەربەندیخان بە شێوەی دووڕیز لە نەمامی یوكالیپتۆس و كازۆرینا(گەز) لە بەردەسورەوە تا بەرلووت، و تاكو ئێستا زۆرێك لەو درەختانە ماون ٥٠ دۆنمی بە تانكەر ئاودێری دەكرا و كەوتبوە ئەو بەری جادەكەوە و ١٠ دۆنمی كەوتۆتەلاكەی تری لەبەردەسوور لە ڕێگای دوو بیری ئیرتوازییەوە ئاودێری دەكرا.

٦ـ لە ساڵی ١٩٨٥ حكومەت پرۆژەیەكی ئاودێری بە پرژاندن(الری بالرش) دامەزراند بە رووبەری ١٠٥٠ دۆنم لە تەختایەكانی نێوان كەلاری كۆن و قەزاكە لە لای ڕۆژهەڵاتەوە، بەڵام پێش ئەوەی بخرێتە كار هەرهەموو ئامێرەكانیان گواستەوە بۆ شوێنێكی تری عێراق.

٧ـ لە ساڵی ٢٠٠٩بینایەك بۆ چاودێری عەلوە لە نزیك عەلوەكە درووستكرا.

٨ـ لە ساڵی ٢٠١٠ حكومەتی هەرێمی كوردستان بینایەكی دوو نهۆمی بۆ بڕێوبەرایەتی گشتیی كشتوكاڵی گەرمیان درووست كرد كە كەوتۆتە سەر جادەی گشتی كەلار كفری، و بینایەكی كۆگا لە بەرامبەر ویستگەی باخی كەلار و هۆڵێكی ڕێنمای لە ب.كشتوكاڵی دروستكرا. هەر لە هەمان ساڵدا كارگەیەكی پاكردنەوەی گەنم لە نزیك قەبرسانی كەلار لەگەڵا گۆڕەپانێكی وەرگرتنی گەنم و قەپانێكی ئوتوماتیكی درووستكرا.

٩ـ لە ساڵی ٢٠١١ بینایەكی دوو نهۆمی بۆ ب.توێژینەوەی گەرمیان و ب.بەرهەمهێنان و پەسەندكردنی تۆو دروستكرا لەگەڵا دووبینای گەنحینەی كە كەوتۆتە نێو زەویەكانی ویستگەی باخی كەلار لە نزیك قەبرسانی كەلار.

١٠ـ لە ساڵی ٢٠١٤ بینایەك و پرۆژەیەك بۆ هەڵهێنەری ماسی درووستکرا لەگەڵا ٦ حەوزی ماسی و بیرێکی ئیرتوازی و دەکەوێتە نێو زەویەکانی ویستگەی باخی کەلار، و دانانی فوول ئۆتۆماتیکی کەلار بۆ پێوانی با و باران و شێ و گەرما و ...هتد و لە نێو ویستگەی باخی کەلار.

١١ـ دروستکردنی پارکێکی دارستانی دەستکرد بە ڕووبەری ٣٠٠ دۆنم لە ساڵی ٢٠١١ـ ٢٠١٤ لە تەنیشت کەمپی زانکۆ لە بەردەسوور کەبە شێوازی دڵۆپاندن ئاودێری دەکرێت و بە پارکی (هەژار) ناونرا ، و هەوەها پارکی دارستانی دەستکردی(دێبنە) لە نزیك مەزاری گۆڕستانی ئەنفال بە ڕووبەری ٤٠ دۆنم هەروەها نەمام گەیەکی ٤ دۆنمی لە بەرامبەر قەڵای شێروانە لە نزیك گۆڕستانەکەوە دروستکراوە بۆ بەرهەم هێنانی نەمامی کوردستانی.

١٢ـ لە ساڵی ١٩٩٥ بەڕێوبەرایەتی ڤێرتەرنەری گەرمیان دامەزرا و لە ساڵی ١٩٩٨ بینایەکی بۆ درووستکرا لە سەر جادەی گشتی کەلار/سلێمانی کە ئێستاش هەرماوە، و لە هەمان بینا شوێن بۆ بەشی ڤێرتەرنەری کەلار کرایەوە و خرایە سەر ئەو بەڕێوبەرایەتیە.

## سێیەم: زەوییە کشتوکاڵیەکان.

کەلار دەکەوێتە نێو ناوچەی نیمچە شاخاویەکانەوە. بەڵام تاڕادەیەکی زۆر تەختاییە و بەرزێکەی بە شێوەیەکی گشتی دەگاتە ٢٠٠ـ٣٦٠مەتر لەسەر ئاستی ڕووی دەریاوە، خاکی ناوچەکە بە گشتی بە پیتە بۆ کشتوکاڵاو لە جۆری(قاوایی سووورباوی قووڵا) ە، ڕێژەی مادەی ئۆرگانی تێدا گونجاوەو دەگاتە ١ـ٢%، و جۆرێکی تری (خاکی نشتەنی)ە و لە ئاکامی کرداری ڕاماڵین و داماڵینەوە درووست بووە چونکە نزیکن لە ڕووباری سیروان و لە لێواری چەمەکان، ئەم خاکە فشەڵە و توانای مژینی ئاوی زۆرە بۆیە بۆ کشتوکاڵاکردن زۆر شیاوە، و هەروەها ڕێژەی شۆرەکایەتیان کەمە،و دەشتەکانی شێروانە و سەیدخلیل و گردەگۆزینە و سەیل ماڵا و بنگرد و کەلاری کۆن بە باشترین زەویەکانی ناوچەکە لە ڕووی بەپیتی و تەختاییەوە دەژمێردرێن .

## ڕووبەری زەویەکانی کەلار

| ژ | ناوی ناحییە | زەوی کشتوکاڵی بەراو | زەوی کشتوکاڵی دەیم | کۆی زەوی کشتوکاڵی | زەوی بەردەلانی | زەوی لەوەڕگا | ڕووبەری گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | | ١٨٠٦ | ٥١٢٩٣ | ٥٣٠٩٩ | ١٤٤٧٨ | ١٠٢٢٥١ | ١٦٩٨٢٨ |
| ٢ | | ٢٠٣ | ٧١٦٢٣ | ٧١٨٢٦ | ٨٣٩٢ | ٩١٧٥٣ | ١٧١٩٧١ |
| ٣ | | ٦٥٥٥ | ٦٩٥٤٣ | ٧٦٠٩٨ | ١٠٩١٣ | ٢٩٨٧٢ | ١١٦٨٨٣ |
| ٤ | | ٨٥٦٤ | ١٩٢٤٥٩ | ٢٠١٠٢٣ | ٣٣٧٨٣ | ٢٢٣٨٧٦ | ٤٥٨٦٨٢ |

**چوارەم : سامانی کشتوکاڵی:**

ناوچەی کەلار ئاو هەواکەی لە هاوینان ووشك و گەرمە و لە زستانان سارد و بەبارانە و دەکەوێتە نێو هێڵی بارانیی ساڵانەی ٢٠٠ـ٣٥٠ملم و بە نیچە مسۆگری باران دەژمێردرێت،ولە ساڵێکەوە بۆ ساڵێکی تر جیاوازی لەو ڕێژە بارانەدا ڕوودەدات و لە زستانا زۆر بە کەمی تووشی پەستان دەبێت،و بەدەگمەن بەفری تێدادەبارێت.

## تێکرای بارانی ساڵانە شاری کەلار

| ژ | ساڵ | تێکرای بارانی ساڵانە بە ملیم |
|---|---|---|
| ١ | ٢٠٠١-٢٠٠٠ | ١،٣١٣ |
| ٢ | ٢٠٠٢-٢٠٠١ | ٣٩٥، |
| ٣ | ٢٠٠٣-٢٠٠٢ | ٣٠٥٥ |
| ٤ | ٢٠٠٤-٢٠٠٣ | ٢٧٤٥ |
| ٥ | ٢٠٠٥-٢٠٠٤ | ٣٤٨٠٧ |
| ٦ | ٢٠٠٦-٢٠٠٥ | ٣٢١ |
| ٧ | ٢٠٠٧-٢٠٠٦ | ٢٧٢٥ |
| ٨ | ٢٠٠٨-٢٠٠٧ | ١٠٦٥ |
| ٩ | ٢٠٠٩-٢٠٠٨ | ٢١٥ |
| ١٠ | ٢٠١٠-٢٠٠٩ | ٣٨٥٨ |
| ١١ | ٢٠١١-٢٠١٠ | ٢٤٥٧ |
| ١٢ | ٢٠١٢-٢٠١١ | ٢٧٦٤ |

سەرچاوە ئاودێرەکانی جۆراوجۆرن، لەوانە (ڕووباری سیروان) بە درێژای مێژوو لەو ڕووبارەوە جۆگەڵە هەڵکەنراوە و ئاوەکەیان گەیاندۆتە زەوییە تەختایەکان، جگە لەوەی سەرچاوەکانی هەبووە وەکو ئەو جۆگەیەیی کەلە گوندی ((سیدخەلیلەوە) ووە کانیاوەکەی نزیك بوە و هاتوە بۆ کەلاری کۆن و بۆ کاری کشتوکاڵی بەکارهێنراوە و ئێستا لە کار کەوتووە دواتر پشتیان بە بیری قووڵا بەستوە و یەکەمین لەساڵی ١٩٥٣ لە گوندی کەلاری کۆن لێدراوە بۆ ئاوی خواردنەوە دواتریش بە سەدەهابیر بۆکاری کشتووکاڵی لە ناوچەکەدا لێدراوە و لە قوڵای ٥٠-١٠٠ م ئەو ئاوە لە کەلاردا دەست دەکەوێت. هەروەها بیری نیمچە قووڵا (ناعور) زۆر بە بڵاوی لە دەوروبەری کەلاردا بۆ کشتوکاڵا کردن لێدراوە ، هەروەها پرۆژەیەکی لەنزیك کەمپی زانکۆی گەرمیان لەلایەن حکومەتەوە دروستکراوە بەشێوەی پەمپ ئاو هەڵدەدات لە ڕووباری سیروانەوە بۆ دەشتایەکانی کەلار بەرەو کەلاری کۆن لە ڕێگای کەناڵێکی کۆنکرێتییەوە و نزیکەی ٤٥٠٠دۆنم بەراو دەکات بەڵام لە کاتی ئێستادا پەمپەکانی لە کار کەوتوون.

جگە لە گەنم و جۆ و نیسك و نۆك و كونجی و كەتان و پاتاتە و شووتی و كاڵك و سەوزەوات بە زۆری لە لێوارەكانی سیروان دەچێنران و چەندین باخی قەیسی و زەیتوون و خورما و هەنار و هەنجیر و مرزەمەنیەكان و خورما لە دەورووبەری شار و گوندی گردە گۆزینە دەچێنران ، و دواتریش بەهۆی لێدانی بیرەوە ژمارەیەكی زۆر لە باخ لە ڕۆژئاوا و باكوری ڕۆژئاوا شارەكە دروستكراوە، گوندی گردەگۆزینە لە ناوڕاستی هەشتاكانی سەدەی ڕابردووەوە تاوەكە ئێستا بۆتەمەڵبەندی بەرهەمهێنانی سەوزە گەڵاییەكان وەكو( كەرەوز، تەڕەتیز،كەوەر،كاهو،شێلم،شوویت،گێزەر،پیاز،و...هتد) ڕۆژانەو بەدەیەهل ئۆتۆمبیل باری سەوزەی گردەگۆزینە ڕەوانەی شارەكانی سلێمانی، چەمچەماڵا، شارەزوور،كەركووك، كفری، دەكرێت و ناوبانگێكی باشی هەیە. چونكە پشت بە ئاوی خاوێنی بیر و ناعوور دەبەستێت.

| ژ | جۆری ئامێر | ژمارە |
|---|---|---|
| ١ | تراكتۆر | ٦٠٠ |
| ٢ | تۆودەر | ١٢٠ |
| ٣ | بیری قوڵی مۆڵەت پێدراو | ١٢٠ |
| ٤ | ناعوور | ٢٣٠ |
| ٥ | خانوی پلاستیك | ٢١٢ |
| ٦ | دەڕاسە(كۆمپاین) | ٩٥ |
| ٧ | سیستەمی ئاوەدان/دڵۆپاندن | ٢٠ |
| ٨ | سیستەمی ئاوەدان/ پرژاندن | ١٢٥ |
| ٩ | كاكوت | ٤٥ |
| ١٠ | هەنگەڵان | ١٢٠٠ كورە |

**پرۆژەکانی سامانی ئاژەڵی لە سنوری قەزای کەلار:**

| ژ | شوێن | پرۆژەی بەخێوکردنی مریشك | هۆڵ | هەڵهێنەری مریشك | پرۆژەی بەخێوکردنی ماسی |
|---|---|---|---|---|---|
| | ناوەندی کەلار | ٥٨ | ٦٨ | | ٢ |
| | پێباز | ٢١ | ٢٩ | ١ | |
| | رزگاری | ١ | ١ | | |
| | کۆی گشتی | ٧٩ | ٩٧ | | ٢ |

**باخەکانی سنوری گەرمیان.**

| ژ | ناوی گوند | ژ. باخ | رووبەر/دۆنم |
|---|---|---|---|
| ١ | کەلاری کۆن | ١٥٥ | ٧٢٢ |
| ٢ | بنگرد | ١١٢ | ٥٨٣ |
| ٣ | گێژەکان | ٢٨ | ١٤٠ |
| ٤ | گردەگۆزینە | ٢٣ | ٧٨ |
| ٥ | سیدخلیل خلیفە+سیدخلیل فقی مستەفا | ١٦ | ٢٦ |
| ٦ | گوندەکانی تر | ٩ | ٤٨ |
| ٧ | کۆی گشتی | ٣٤٣ | ١٥٩٧ |

**ژمارەی مەڕ و بزن و مانگا لەسنووری قەزای کەلار**

| ژ | شوێن | ژ. گوند | ژ. مەڕ و بزن | ژ. مانگا |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ناوەندی کەلار | ٢٥ | ٥٣٤٢٠ | ٢١٣٣ |
| ٢ | ناحیەیی رزگاری | ٦٢ | ٧٣٥٦٠ | ٢١١ |
| ٣ | ناحیەی پێباز | ٦٤ | ١٢٨٣٧٤ | ١٧٩٨ |
| ٤ | کۆی گشتی | ١٥١ | ٢٥٥٣٥٤ | ٤١٤٢ |

## سەرچاوەکان:

١ـشارەزای و کارکردنی خۆم لە ساڵی وەزیفیم لە فەرمانەگەی کشتوکاڵی کەلار و کفری و گەرمیان.

٢ـ داتایی  بڵاونەکراوە لە ب.گشتی کشتوکاڵی گەرمیان و ب. کشتوکاڵی کەلار و زانیاری لە بەڕێزان کاك جلال کاکە عبدللە و کاك کمال محمد غریب و کاك غازی ستار اسماعیل.

٣ـ ڕزگار حاجی حمید/کەلار،مێژوویەکی دێرین و جوگرافیایی شارێکی دێرین/١٩٧٠ـ٢٠١٣ چاپی یەکەم/چاپخانەی یاد/٢٠١٥

٤ـ مقداد شاکەلی/شاری کەلار/لێکۆڵینەوەیەك لە جوگرافیایی شار/چاپی یەکەم/چاپخانەی گەنج/٢٠١٦.

٥ـ محمد شاکەلی/قەزای کفری،شارەدێی کەلار لە پەنجاکاندا و پاسەکەی حاجی (١٩٦١١ـ١٩٧٥) چاپخانەی کارۆ/٢٠١٦.

# کەلاری باشوری کوردستان و کەلار دەشتی ئێران لە بەراوردێکدا!





- ن : بورهان محمد فرج

لە بابەتێکی مێژوویيدا بە ناونیشانی (کەلار لە سەرە قەڵەمێکدا !) کە لە رۆژنامەی کوردستانی نوێ ی ژمارە (٦٥٦٩) لە ٢٠١٥/١/١ بڵاوکرایەوە ، بە کورتی تیشك خرابووە سەر مێژووی کۆنی کەلارو سەرەتای دروستبوونی و ئەو خێڵ و عەشیرەتانەی لەو ناوچەی نیشتەجێ بوون ، کاریگەری هەندێ لە گۆرانکارییە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان لەسەر ناوچەکە.

هەندێ بیرورا هەن سەبارەت بە بوونی پەیوەندی لە نێوان کەلاری گەرمیان و کەلاردەشت دا هەیە ، بە پێویستم زانی ئەم بابەتە لە بەر رۆشنایی بە دواداچوون و زانیارییە راستەکان روون بکەمەوە و لەم نووسینەدا هەردوو بابەتەکە کۆکەمەوەو پێکەوە بیانخەمە روو:

نووسینەوەی مێژووی شارو شارۆچکەکان لە تۆماری مێژوویی کورددا نوێ یە ، بە بەراوورد بە مێژووی نووسینەوەی مێژووی شارو شارۆچکەکانی دونیا ، هەرچەند ئەو ئەرکە گرنگییەکی ئێجگار زۆری هەیە بۆ پڕکردنەوەی کەلێنەکانی مێژووی شارستانی هەر وڵات و گەلێك.

هیچ شارێك خۆڕسك دروست نەبووە ، ئەگەر هۆگەلێك نەبووبێتە مایەی دروست بوونی ، لە نموونەی فەراهەم بوونی هۆكانی ژیان و گەشەكردنی ، لە باری هەڵكەوتەی جوگرافی و بە پیتی خاك و بوونی سەرچاوەی ئاو (روبارو دەریاكان) ، دواتر لەباربوونی هەل و مەرجی سیاسی و ئابوری و بازرگانی.

پاراستنی شوێنەوارە ئەركیۆلۆجییەكان ، فاكتەرێكی تری بە هێزە بۆ هێشتنەوەی زیندوویەتی شارێك و گەشەكردنی لە رووی گەشتیارییەوە!

**باسەكە لە سەر شاری كەلارە:**

لە رووی جوگرافییەوە : - كەلار دەكەوێتە رۆژئاوای رووباری سیروان ، لە باشورەوە دێ ی گردەگۆزینە و لە باكورەوە دێ ی (سەید خەلیل و قاسم ئاغا) یە رۆژ ئاوای كەلار دەشتی شاكەلە و رۆژهەڵاتیشی رووباری سیروانە

ئەم ناوچەیە پێدراوە مێژوویەكەی و ئاماژەكانی ، ئەو راستییە دەسەلمێنن ، كە ناوچەیەكی ژیاری زۆر كۆنی تێدایەو دیارترینییان كاركردن بووە لە بواری كشتوكاڵدا ، چونكە شوێنەواری ئاودێری دەشتایی بە پیتی كەلار ئەو راستییە دەسەلمێنێ ، بە تایبەت جۆگەو پرۆپرۆژەی (ئاوی گاوریەكە ) كە ئاوی روباری سیروان دەگەیەنێتە دەشتی (گومار) ، ئەو پرۆژەیە بە خشتی سوورەوەكراو دروست كراوە لە سەردەمی ساسانییەكاندا!

جگە لە وانە ، چەندین گردی تورەكەرێژ هەبووە و تا ئێستاش هەن و راستی بوونی ژیان و گوزەران لە ناوچەكەدا دەردەخات . یەكێك لەو گردانە گردی (شێروانە) بووە ، كە ژمارەیەك ئاسەواری تێدا بینراوەو دۆزراوەتەوە بە پێی قۆناغە مێژووییەكان.

ئەوەی لای من ئاشكرایە ، گردی شێروانە وەك پایەتختی گەرمیان بووە لە هەموو سەردەمەكاندا (كیشییەكان ، ساسانییەكان ، ئیسلام و تا دەگاتە سەردەمی حەمە پاشای جاف).

مستەر ریچ ( CLAUDIUS JAMES RICH ) لە گەشتی ریچ بۆ كوردستان ساڵی ١٨٢٠ز دا ئاماژە دەكات لە كاتی سەردانی بۆ (حەوش كوڕو) بۆ لێكۆڵینەوە لە ئاسەوارەكەی ، دەبێژێ "لەپاش ئەوەی بەرەو رۆخی روباری (دیالی) واتە (سیروان)* بەڕێكەوتم ، لە سەر رۆخی سیروانەوە بینیم گردێكی تورەكەرێژ ناوی گردی شێروانە بوو ....تد " (گەشتی ریچ بۆ كوردستان ١٨٢٠ ، و:محمد حمە باقی ، ل٣٧٨ چاپی پێنجەم) .... لە گەشتنامەكەدا ریچ ئاماژە بە گردی تورەكەرێژ دەكات و ناڵێت : قەڵا! بۆیە دیارە لە پاش ١٨٢٠ قەڵای شێروانە لەسەر ئەو گردە دروستكراوە!

هەر بۆ پشتراستكردنەوەی ئەم بۆچوونە ، بەو گوندەش كە نزیك بووە لە گردەكەو ئێستا یەكێكە لە گەڕەكە كۆنەكانی شاری كەلار وتراوە (بنگرد) نەوتراوە (بن قەڵا) بە پێچەوانەی قەڵای هەولێرەوە كە مێژووەكەی كۆنەو بە ئاوەدانییەكانی بن قەڵاكە دەوترێ (بن قەراتی)

سەرەرای ئەوەی مستەر ریچ لە روباری سیروان پەڕیوەتەوە بۆ گوندی (زەنگاباد) كە ئەو بە (زەنگ ئاباد) ناوی دەبات ، دەڵێت "چەندین گردی تورەكەرێژ هەیە و (قەلات تەپەسپی) خشتەكن و خشتیان لێ دەردەهێنان" كەوا بوو ئاسەواری كۆنتری تێدا بووە ، هەروەها ئاماژە دەكات بەو گردانەو كە لە گردی (بابل) ی دەچوون.

كەس ناتوانێت بڵێت ئەم ناوچەیە ، ناوچەیەكی قەرەباڵغ نەبووە ، چونكە دیسانەوە ریچ باس لەوە دەكات "كەلاوەیەكی ئێجگار زۆر لەو ناوچەیە هەیە بە تایبەت لە نێوان كفری و زەنگاباددا.

بوونی كەلاوەش لەو ناوچەیە ، ئاماژەیەكی روونە بۆ ناسەقامگیری دانشتوان لە رووی(سروشتی و سیاسی و ئابوری)یەوە ، ئاشكرایە هۆزی جاف لە گەرمیان و كوێستاندا بوون و لە هەردوو وەرزی زستان و بەهاردا هاتوونەتە گەرمیان و ماونەتەوە و كەلارەیان دروست كردووە (كەلارە: ئەو شوێنەیە ، كە بۆ هەڵگرتنی سووتەمەنی بەكاردێت بە تایبەت (پشقلی مەڕو بزن).

جگە لە جاف چەندین عەشیرەتی تر لەكۆنەوە لەو ناوچەیە ژیاون ، بە تایبەت (زەنگەنە ، گێژ ، رۆژبەیانی ، پاڵانی ، سەیدو شێخان ) مەبەستم لە عەشیرەتەكانی دەشتی شێروانەو شاكەلە ، بۆیە ناوی عەشیرەتەكانی تر ناهێنم ، بۆ نموونە هەردوو گوندی ( كەوا چەرموو ، ئەوڵا قوت) بەناوی دوو كەسایەتی عەشیرەتی رۆژبەیانییەوە ناوبراون.

مێژووی دروستبوون و ئاوەدانكردنەوەی كەلار دەگەڕێتەوە بۆ پێش دروستبوونی قەڵای شێروانە ، رێك لە سەردەمی (مەحمود پاشای جاف)دا ، كە ئەو دەمە مەحمود پاشا لە (قەڵای پاشا) جێگیر بوو بوو.

خێڵەكانی جاف بۆ گوزەرانی ژیان گەرمیان و كوێستانیان دەكردو دەوارنشین بوون ، لەوكاتەدا خێڵی (عەباس جەلیل)یش كە بە هەمانشێوە دەوارنشین بوون لە دەشتی شاكەل و گوماردا شوانكارەبوون و مەڕوماڵاتیان بەخێو كردووە ، بۆ دروست كردنی چەرداخ (كەپر) ، لە چەمی سیروان قامیشییان هێناوە، كە گەشتوونەتە (كەلارە)كان باریان خستووەو دواتر بۆ وەرگرتنی رەزامەندی چوونەتە لای (مەحموود پاشای جاف)و داوایان لێكردووە رێگەیان بدات (كەلار) ئاوەدان بكەنەوە ، ئەویش رازی بووە. ئیتر بۆ یەكەم جار لەسەر (خڕەكەی كەلار : كە چەمێكی بەردەڵانییەو بە بەردیان وتووە خڕ یان خڕك) نیشتەجێ بوونەو دواتر (خڕەكە) ناونرا (خڕی حاجی) واتە بە ناوی (حاجی ئەڵماس)ەوە ناونرا . كە

کوڕە گەورەی (عەباس جەلیل) ەو ، کوڕە بچوکەکەشی ناوی فەرەج بووەو دوو کچیشی هەبووە بە ناوەکانی (عاصمەو دورسە).

پاشان (حەسەن بەگ)ی باوکی (حەمە رەشید بەگ) هاتووەتە کەلارو لەگەڵ بنەماڵەی (عەباس جەلیل)دا سەقامگیر بووە ، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نێوان ساڵانی (١٨٦٠ – ١٨٦٥).

دوای ئاوەدانکردنەوەی (کەلاری کۆنی) ئێستا ، قەڵای شێروانەش ئەو کۆشك و تەلارەی لەسەر دروستکراوە لەسەر دەستی (حەمە پاشای جاف) و مستەر ریچیش ئەوەی بۆ ساغ کردووینەتەوە!

بیرۆکەی وەها نوسینێك لەوەوە سەرچاوەی گرت ، کە دیدو بۆچوون و گێڕانەوەی جیاواز دەبینم و دەخوێنمەوە ، کە گوایە ناوی کەلار لە (کەلاردەشت)ەوە هاتبێت ، کە ئەمە راست نییەو ، چیرۆکی ئەم بۆچوونەش تەنیا لەوەوە هاتووە ، کە بەگزادەکانی جاف لە گەشتێکیاندا سەردانی باکوری ئێرانییان کردووەو چوونەتە ناوچەیەك کە ناوی (کەلار دەشت) بووەو لە دانشتوانەکەیان پرسیوە "چین؟ " ئەوانیش وتوویانە "ئێمە عەشیرەتی گێژین و ئەهلی حەقین ."

ئەگینا چەند پشتێکی تری ئێمە هەر لەم ناوچەیە ژیاون و مردوون و زانیارییەکانم لەدەمی کەسە بە تەمەنەکانی بنەماڵەکەمان بیستووە ، کە لە سەدەی ١٩دا ژیاون و خۆیان و تەمەنییان شایەتحاڵی ئەو گوزەرانەبوون، کە لەم ناوچەیە گوزەراوەو چەندین ئاسەواری تریش دروستی زانیارییەکان دەسەلمێنن ، بۆ نموونە لەپشت گوندی دێبنەوە شوێن هەوارێك هەیە پێی دەوترێ (کاکولیل) کە خەڵکی سادە بە (کاکولی) ناوی دەبات ، ئەم (کاکولیل)ە باپیرەی (عەباس جەلیل)ە و کاتی خۆی لەو شوێنە نیشتەجێ بووە.

نارەوایە مێژوو وەك خۆی نەپارێزین و نەوەکانی ئێستا و داهاتوو مێژووی دەوڵەت شارەکانی یۆنان و تەنانەت شارە بەناوبانگەکانی دونیا بزانین و مێژووی شارو شارۆچکەکانی خۆمان نەزانین!!

ئەرکی سەرشانی ئێمەومانانە ، کە شایەتحاڵی مێژووی گەشەکردنی شاری کەلارین، کە تەمەنی نزیکەی نیو سەدەیە و ئێستاش یەکێکە لە شارە دیارو بەرچاوەکانی باشووری کوردستان ، لە بەر هەڵکەوتەکەی ، پارچەیەك زەوی نیشتەجێبوون لەم شارەدا لە زۆربەی زەوی شارەکانی جیهان گرانترە ، هەرچەند ئەم بابەتە پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زیاترە!

لە ئێستادا کەلار ژمارەیەکی زۆر بڕوانامەدارو کەسانی هەڵکەوتووی تێدایە ، نەوەی نوێ خولیای زانینی مێژووی شارەکەیانن ، بەو دەلیلەی هەندێ هەوڵ دراون بۆ نووسینەوەی چەند کتێب و بابەتێکی رۆژنامەوانی لەو بوارەدا و مشت و مڕی دروست کردووە لە سەر ساغکردنەوەی ناوی کەلار ، بۆ

دووپاتکردنەوەو ساغ کردنەوەی بوونی ئەو پەیوەندییە ، لە سەردانێکدا بۆ باکوری ئێران بەباشم زانی بە دواداچوون بۆ رایەڵەکانی پەیوەندی نێوان هەردوو کەلار بکەم.

**چی هەیە لە نێوان کەلاری باشوری کوردستان و کەلار دەشتی ئێران ؟**

گەڕیدەکان زانیارییەکی بێ شومار تۆمار دەکەن و لایەنی شاراوەی رووندەکەنەوە لە بوارە جیاجیاکاندا ، بە تایبەت بواری مێژوو جوگرافیای سەر زەمین : هەر یەك بە مەبەستێك و لە بوارێکدا کار دەکات بە پێی پسپۆڕی و هیوایەت و ئارەزووەکانی خۆی ، هاوکات هەر کەسێك بە پێی بیرو توانای هزریی خۆی رووداوەکان شرۆڤە دەکات ، کۆمەڵگە بە دیدی خۆی و ژیانبینی تایبەت بە خۆی ئاشنا دەکات و بە ئازارو خولیاکانی لە دەرگاکان دەدات و بەدوای کلیلی چارەسەردا دەگەڕێت.

دەسەڵاتیش بە پێی بەرژەوەندی خۆی هەموو بابەتەکان شەن و کەو دەکات و زۆرجار رووداوە مێژووییەکان بە پێی بەرژەوەندییەکانی تۆمار دەکات و دەیەوێ لە دیدی خەڵکدا راستەقینە بوونیان بسەلمێنێ ، بە پێچەوانەوە کەسانی شارەزا وردتر لە مێژوو دەڕوانن و هەوڵی راستکردنەوەی رووداوە ئاوەژووکراوەکان دەدات.

ئەوەی لێرەدا مەبەستمە بیڵێم لە سەردانێکمدا بۆ وڵاتی ئێران چوومە باکوری ئەو وڵاتە (چالوس و ناوچەی کەلار دەشت) کە نزیکەی ١٥٠ کم لە تارانەوە دوورە ، بەڵام لە بەر سەختی هەڵکەوتەکەی و بەرزی شاخەکانی و پێچاوپێچی ڕێگەکەی ، بە ٤ کاژێر گەشتینە جێ ، ئەم ناوچەیە لە کەرەجەوە بەرەو بەرزاییەکان دەچێت و بۆ لێدانی جادەوبان زۆربەی شاخەکانییان لە شێوەی تونێل بڕیوە بە ئامێری سەرەتایی و لە سەردەمی رەزا شای باوکدا دروست کراون.

تا لە چالووس نزیکتر دەبیتەوە شاخ و درەخت و دیمەنەکانی سروشت دڵرفێنتر خۆ دەنوێنن ، جوانی و رەنگینی ئەم ناوچەیە سەرنجراکێشترە ، کاتێ ئاژەڵە کێوییەکان خۆ دەخەنە بەرچاو ، ئاشکرایە (چالوس) دەکەوێتە سەر رۆخی دەریای خەزەر (کەلار ئاباد) یش هاوسنوورێتی و لە هاویندا پلەی گەرمای بەرزەو کەش و هەواکەی شێدارو بێزارکەرە ، بە هۆی دەریاکەوە.

بەڵام (کەلار دەشت) دەکەوێتە سەر چیا بەرزەکانی و دامێنی چیای تەختی (سلێمان و سیاکمان و قەڵای ئەردەشیر) کە زۆر بەرزن ، بۆیە بە هاوینانی کەش و هەوا فێنکە و زستانیشی سەخت و بەفراوییە!

لە سەر چیاکان دەشتێکی فراوان هەیە و تەپە یان گردی کەلار لە خۆ دەگرێت و زۆر بە پیتە بۆ کشتوکاڵی گەنم و جۆ و بە خێوکردنی ئاژەڵ ، بۆیە ساڵانی پێشوو کارو پیشەی سەرەکی دانیشتوانی

ناوچەکە جوتیاری و ئاژەڵداری بووە و دەشتایی سەر شاخەکان لە شێوەی حەوزێك دایە بۆ ئەو مەبەستە و سەوزایی و دارستان و جەنگەڵ و جۆرەها ئاژەڵ و باڵندەی کێوی ناوچەکەی کردووەتە بەهەشتی سەر زەمین!

لەبەر سەختی ناوچە شاخاوییەکانی کەلار دەشت ، بە زستان دانشتووانەکەی دادەبەزنە خوارەوە بۆ سەر دەریاکەو ئەو ناوچەیەی کە خۆیان دیارییان کردووەو ناوی (کەلار ئاباد) ە ، واتە گەرمیان و کوێستان دەکەن ، لە زستاندا دێنە خوارەوە بۆ کەلار ئاباد و هاوینان سەر دەکەون بۆ کەلار دەشت!

وشەی کەلار : کەلار تەپە یان گردێکە لە سەر شاخەکان و شوێنەوارێکی کۆنە و دەشتێکی فراوانی لە خۆ گرتووە ، کەواتە ( کەلار یانی گرد ) ئەم (وشەیەو ماناکەی) ئەو پەیوەندییەی دروست کردووە لە نێوان کەلار دەشتی ئێران و کەلاری گەرمیان و باشوری کوردستان ، ئەمە جگە لەوەی دانیشتوانی ناوچەکە خۆیان بە کورد دەزانن و بە زمانی لەکی دەپەیڤن!

لە کاتی ئاخاوتنماندا لە گەڵ خەڵکی ناوچەکە و پرسیار کردن ، ئایا وشەی کەلار لە چییەوە هاتووە و سەرچاوەی گرتووە ؟

موجتەباە جەعفەر صالحی تەمەن (٥٤) ساڵ ، دانشتووی رەسەنی کەلار دەشت وتی " کەلار واتە تەپە یان گرد" .... یانی بە ناوی تەپەکەوە یان گردەکەوە ئەم دەشتە ناونراوە.

بە پێی قسەکانی ناوبراو و حەسەن مورید پووری تەمەن (٧٧) ساڵ ، لە ٧٠% ی دانشتوانی کەلار دەشت کوردن و بە دیالیکتی (لەکی) دەدوێن ، مورید پوور وتی " من تا ئێستا (٩) نۆ نەوەو پشتمان لێرە ژیاون و بە دیالیکتی لەکی دواون . ئێمە کوردین و ئەم هۆزانەش لەم ناوچەیە هەن (سەهن ، هەرسین ، گەروس ، خەزەری ، دلڤان و گێجان ) کە لە کوێستانن ، (خەجەوەند ، شاسەوەند ، کاکەوەند و شیسەوەند(

ئەم هۆزانە هەندێکیان شیعە مەزەبن و هەندێکیان ئەهلی حەقن و عەلی ئیلاهین ، واتە هەندێکیان زەردەشتین و هەندێکیان موسوڵمانن.

هەندێکیان دەڵێن ئێمە سەرچاوەی تەصەوفمان دەگەرێتەوە بۆ بەرزنجەو لە تەریقەتی قادرییەوە نزیکین ، بە پێ ی وتەی (موجتەباە جەعفەر صالحی) ژمارەیەکی زۆری کورد لە مەشهەدن و بە بە دیالێکتی کرمانجی دەئەخاڤن ، دیارە ئەوانیش کێشەو دەردەسەری زۆریان هەبووەو هەیە ، بە تایبەت لە رووی نەتەوەییەوە چەندین ساڵە چەوسێنراونەتەوەو دژایەتی کراون!

**پرسیارم لەوان و لە خۆم ئەوەیە ، ئەو کوردانە بۆچی چوونەتە ئەوێ ؟**

هەمووان ئەوە دەزانین کورد بە درێژایی مێژوو چەوساوەتەوەو لە زێدی باوباپیرانی دوورخراوەتەوە ، بە چەندین هۆکارو مەبەستی جیا و قۆناغ و هەلەمەرجی جیاواز.

لە پێش دەسەڵاتی صەفەوییەکان (٩٣٠ ك / ١٥٢٤ ز) لە داوێنی چیاکانی قەوقازەوە تاکو خوارووی دەریاچەی ورمێ شوێن و ژیانی هۆزە کوردەکان بووە.

چەندین و شەڕو هێرشی بە هێزو تاڵانی ئیسلام و عەرەب و ئێلی تورکان نەیانتوانی دیموگرافیای ئەو ناوچەیە بگۆڕن  کە زۆرینەی دانیشتوانەکەی کوردن ، سەرەڕای ژمارەیەك هۆزو بنەماڵەی تورك و ئازەر هاتنە ناوچەکە ، بەڵام هێشتا زۆرینەی دانشتوانەکەی کوردن.

شا ئیسماعیلی صەفەوی دامەزرێنەری دەوڵەتی صەفەوی وڵاتی ئێران (١٥٠١ – ١٥٢٤ز) هەموو هەوڵێکی دا بۆ وەرگرتنەوەی دەسەڵاتی سەردارانی کوردو دانانی قزڵباشەکان لە جێگایان و بڵاوکردنەوەی مەزەبی شیعە لە ناو کوردانداو ، لە بەربڵاوترین هێرشیاندا بۆ (کوردستان ، دیاربەکر ، موصل ، لوڕستان و بەغدا)  هەموو کوردستانی داگیر کرد بە زەبروزەنگ و بێ بەزەییانە دەستی نەپاراست و شەڕی چاڵدێران لە سەردەمی ئەودا هەڵگیرسا و هۆزە کوردەکان کران بە پەردووی ئەو جەنگە نەگریسە.

پاش ئەو شا تەهماسب (١٥٤٤ – ١٥٧٨ز) دژی عوسمانییەکان – سوڵتان سلێمانی قانوونی (١٥٢٠ – ١٥٧٤ز) واتە هەردوو دەوڵەتی صەفەوی و عوسمانی بە رۆڵەی کورد و لە سەر خاکی کوردستان شەڕە گەورەو وێرانکەرەکەیان هەڵگیرساندو بۆ ماوەی دوو دەیە درێژەی کێشا.

لە ئەنجامدا کوردستانییان وێران کردو بەردەوام بوون لە راگواستنی کورد بەمەبەستی گۆڕینی دیموگرافیای کوردستان لە سەردەمی هەموو شاکانی صەفەوی و قاجاریشدا ، بە هەردوو رێککەوتننامەی زەهاو (١٦٧٨ز) و ئەرزەرووم ( ز) شەڕەکە وەستێنرا.

لە سەروبەندی ململانێی نێوان دەوڵەتی صەفەوی و قاجاری و عوسمانییەکاندا و پاشان شەڕی نێوان روسیاو ئێران و تورك ، ژمارەیەکی بێشوماری کوردان پەراگەندە بوون و دوورخرانەوە بۆ دەرەوەی کوردستان ، لەو نێوەندەشدا کوردانی کەلار دەشت لەسەر دەریای خەزەر نیشتەجێ دەکرێن و لە زێدی باوباپیرانییان بە یەکجاری دوور دەخرێنەوەو ئاوارە دەبن ، لە دوای چەندین پشت بە ئاخ و ناسۆرەوە باسی ئەو پرۆسە نەشیاوو نارەوایە دەکەن و هەریەکەیان چیرۆکێکی هەست هەژێنی لایەو باس لە مێژوو رەسەنایەتی خۆیان دەکەن .

لە ئەنجامدا هیچ لێچوونێکی ئەوتۆی مێژوویی هاوبەش لە نێوان هەردوو کەلاردا نەبوو ، جگە لەوەی ناوی کەلار لە (گرد یان تەپە)وە وەرگیراوە ، پێدەچێت ناوی (کەلار)ی گەرمیانیش لە گردی شێروانەوە ، وەك شوێنەوارێکی دێرینی ئەو ناوچەیە وەرگیرابێ ، کە پێ ی وتراوە (دەشتی کەلار) واتە دەشتی گردەکەی شێروانە . بەڵام بە پێ ی دەرەنجامی بەدواداچوونەکەم ، دەرکەوت هۆزی گێژیش، کە کەلاری گەرمیانییان ئاوەدان کردووەتەوە، لە (کەلار دەشت)ی ئێراندا بوونیان نییە!



**دیمەنێك لە کەلاری دەشتی ئێران**

# دوو پەرلەمانتاری کەلاری



• نووسینی : سەباح عەل جاف

## حەمە بەگی فەتاح بەگی حەمە پاشای جاف ( ١٩٠٤ – ١٩٣٤)

حەمە بەگی فەتاح بەگی حەمە پاشای جاف ، لە ساڵی ١٩٠٤ لە دایك بووە ، سێیەمین کوڕی فەتاح بەگ بووە ، پیاوێکی لیهاتوو و خوێنەواری سەردەمەکەی بووە ، حەمە بەگ لە پاش دامەزراندنی حوکمەتی عێراق بوەتە ئەندامی ئەنجومەنی دامەزارندن لە خولی دووەمدا لە ساڵی١٩٢٩ بە نوێنەرایەتی کفری و لیوای کەرکوك ، حەمە بەگ لەگەڵ چەند کەسێکی تردا لە نامەیەکدا بۆ کۆمەڵەی گەلان داوای ئۆتۆنۆمیان بۆ کوردستانی عێراق کردووە ، چەند جارێك یاداشتیان داوەتە مەندوبی سامی بەریتانی لە بارەی کێشەی کوردەوە ، حەمە بەگ لە کۆتای بیستەکاندا لەگەڵ ژمارەیەك رۆشنبیری سنورەکە پارتێك دروست دەکەن ، بە پێی زانیاریەکان حەمە بەگ حەزی نوسینی ئەدەبیشی هەبووە و لەم رووە رۆمانێکی نوسیوە بەلام دواتر فەوتاوە.

بە پێی زۆرێك لە سەرچاوەکان حەمە بەگ رۆڵی هەبووە لە کردنەوە و دامەزراندنی یەکەمین قوتابخانە لە کەلار لە ساڵی ١٩٣١ بە ناوی ( قوتابخانەی کەلاری سەرەتای ) ، بە پێی هەندێك سەرچاوە سەرەتا قوتابخانەکە لە ماڵی حەمە بەگدا بووە واتا ژوورێك لە ماڵی حەمە بەگ بینای قوتابخانەکە بووە و

پاشتر بینایەك لە قورِ لە گوندەکە بۆ ئەم قوتابخانەیە دروست دەکرێت و پاش ئەمیش بینای میری بۆ دروست کراوە ، وەك دەردەکەوێت بە هەوڵی حەمە بەگ ئەم قوتابخانەیە دروست کراوە و خانۆکەی خۆی بەخشیووە و کردویەتی بەم قوتابخانەیە ، ئەم قوتابخانەیە سەر بە بەڕێوەبەرێتی پەروەردەی لیوای کەرکوك و یەکەم بەڕێوەبەری مامۆستا تۆفیق عەلی عەبدولڕەحمان قەرەداغی ( ١٨٨٦ – ١٩٤٧ ) بووە ، لە ساڵی ١٩٣١ – ١٩٤٠ لەو قوتابخانەیە ماوەتەوە.

حەمە بەگی جاف هەمیشە هاوڕێی رۆشنبیر و مەلا و خوێنەوار و پاڵپشتی هەژاران بووە ، یەکەم نوێنەری جاف بووە لە پەرلەمان و یەکەم کەس بووە جل و بەرگی ( ستار خانی ) لەناوچەکە لەبەر کردووە ، لە کفری دەچووە لای رۆشنبیران و مەلا و فەقێیان و بۆ کوردایەتی هانی دەدان ، یەکەم کەس بووە قوتابخانەی لە کەلار کردوەتەوە ، بە پێی سەرچاوەکان حەمە بەگ لەسەرەتاوە ماڵەکەی خۆی کردوەتە قوتابخانە و هانی خەڵکی داوە بۆ خوێندن و خوێنەواری ، ئەم کەسایەتیە لە ١/٥/١٩٣٤ بە نەخۆشی ریخۆڵە کوێرە کۆچی دوای دەکات. .

**سەرچاوەکان:**

- کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف ، تەئریخی جاف ، چ١ ، ( بەغداد : ١٩٩٥).
- ئەحمەد حەمەد ئەمین هۆمەر ،ئەندامە کوردەکانی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقی لە رۆژگاری پاشایەتیدا( ١٩٥٢ – ١٩٥٨ ) ،چ١ ، چاپەمەنی شەهاب ، ( هەولێر : ٢٠٠٧ ) .
- مستەفا نەریمان ، حەمە بەگی جاف هەڵگری ئاڵای تێکۆشانی سیاسی ، نەوشەفەق ، ژمارە ( ٢٥ ) ، نیسانی ٢٠٠٥.
-سەباح عەلی جاف ، مێژووی پەروەردە و فێربوون لە کەلار ، گەرمیانی ئەمڕۆ ، ژمارە ( ٧١ ) ، شوباتی ٢٠١٣.

# جەوهەر نامیق سالم
# یەكەمین سەرۆكی پەرلەمانی كوردستان
# ١٩٤٦-٢٠١١



جەوهەر نامیق سالم لە ساڵی ١٩٤٦ لە گوندی بەرلوت سەر بە قەزای كەلار (ناوەندی ئیدارەی گەرمیان (لە بنەماڵەیەكی نیشتیمان پەروەر لە دایك بووە ، بنەماڵەكەیان تێكەلی خەباتی سیاسی و كوردپەروەری بووە و باوكی ( نامیق سالم ) یەكێك بووە لە ئەندامەكانی حزبی هیوا لە سنوری گەرمیان ، جەوهەر نامیق لە هەرەتی لاوێتیدا دەچێتە ریزی یەكێتی قوتابیانی كوردستان و لەوێوە دەست بە كاری رێكخراوەیی و سیاسی دەكات و لەو دەمانەی لە ریزی ئەو رێكخراوەدا بە كەسێكی چوست و چالاك دەناسریت لای هەموان .

جەوهەر نامیق لە سەرەتای حەفتاكانی سەدەی رابردوو قۆناغێكی تر لە كاری سیاسی خۆی دەست پێ دەكات و دەچێتە ریزی شۆرشی ئەیلولەوە و سەرەتا لەناو ریزەكانی پارتی دیموكراتی كوردستان ، پاشتر دەبێتە كارگێری لقی سێی پارتی و لێرە بە دواوە زیاتر دەبێتە جیگەی متمانەی هاورێ و هاوسەنگەرانی بە تایبەت خوالێخۆشبوو مەلا مستەفای بارزانی ، لە پاش نسكۆی شۆرشی ئەیلول لە ساڵی ١٩٧٥ بە دواوە جەوهەر نامیق دەبێتە یەكێك لەو كەسانەی كە بە نسكۆی شۆرش نیگەران و دڵتەنگ دەبێت و ئەمەیش وا دەكات كە دەست بە ئامادەكاری بكات سەبارەت بە هۆكارەكانی ئەو نسكۆیە و دووبارە دەست كردنەوە بە شۆرش و هەستانەوە ، لە سەر راسپاردەی مەلا مستەفای بارزانی هاورێ لەگەڵ چەند هەڤاڵێكی یەكێك دەبێت لەو كەسانەی كە دەست بە هەستانەوە دەكەن بە گورِوتینێكی تر و لەژێر ناوی قیادە موقەتە ( سەركردایەتی كاتی ) جارێكی تر شۆرش جۆش دەدەنەوە هەر بۆیە لە ٢٦/٥/١٩٧٦ لە ناوەی كوردستان جاری شۆرشی گوڵان دەدرێتەوە كە ئەو كات جەوهەر نامیق بە ( سەلیم سۆرانی )لە نێو هەڤاڵەكانی ناسراو بوو ، یەكەمین بەیاننامەی شۆرشی گوڵان لە

لایەن جەوهەر نامیقەوە ئامادە كرا بە ناوی ( كوردستان گۆڕەپانی راستەقینەی خەباتە ) لەم بارەیەوە مەسعود بارزانی دەنوسێت " رۆڵی كاك جەوهەر لە سەركردایەتی كاتی قەد لە بیر ناكرێت . " ...

لێرە بە دواوە جەوهەر نامیق چەندین پۆست و بەرپرسیارێتی لە نێو ریزەكانی پارتیدا وەر دەگرێت لەوانە ئەندامی كۆمیتەی ناوەندی ، ئەندامی مەكتەبی سیاسی ، لە سەروبەندی راپەرینە مەزنەكەی خەڵكی كوردستان بەرپرسی میحوەری كەركوك – گەرمیانی بەرەی كوردستانی بووە .

جەوهەر نامیق لە پاش یەكەمین هەڵبژاردنی پەرلەمانی كوردستان لە ١٩/٥/١٩٩٢ و لە یەكەمین كۆبوونەوەی پەرلەماندا لە ٤ ی حوزەیراندا دەبێتە یەكەمین سەرۆكی پەلەمانی كوردستان و تا ساڵی ١٩٩٩ وەك سەرۆك مایەوە ، لە ژیانی پەرلەمانتاریدا جگە لە دەر كردنی چەندین یاسا و بڕیار لە سەردەمی ئەودا خاوەنی گەلێك شكۆمەندیە كە دیار ترینیان بریتین لە دەركردنی یاسای فیدراڵی بۆ هەرێمی كوردستان لە ٤/١٠/١٩٩٢ ، یاسای ئاڵای هەرێمی كوردستانی عێراق لە ١١/١١/١٩٩٩ ، پەناگیری نێو پەرلەمان بۆ ماوەی ( ١٠٣ ) رۆژ لەگەڵ پەنجاو هەشت هاوڕێی پەرلەمانتاریدا لە دژی شەڕی ناوخۆ و بەرقەرار بوونی ئاشتی و دژی دەست وەردانی داگیركەران بوو بۆ خۆشكردنی ئەو شەڕە نەگریسە .

جەوهەر نامیق لە پاش پرۆسەی ئازادی عێراق لە نیسانی ٢٠٠٣ وازی لە كاری سیاسی بە تایبەت لە ریزەكانی پارتی دیموكراتی كوردستان هێنا ، سەرباری واز هێنانی لە كاری حزبی بەڵام بوو بە رەخنەگرێكی جدی و بەردەوام هەوڵی چاكسازی دەدا لە نێو حزب و حوكمەتدا ، بەشێكی تەمەنی بۆ نوسین و خوێندەوەی وورد تەرخان كرد ، لە پاش دروست بوونی بزوتنەوەی گۆڕانیش لە زۆر جاراندا پشتیوان و پشتگیری كاری ئۆپۆزسیۆن بوو لە كوردستان و بە مۆدێلێكی نوێی لە كاری سیاسی دەزانی ، هەر چەندە بۆ خۆی دەرچووی كۆلێژی ئابوری بووە لە بەغدا بەڵام خاوەنی چەندین بەرهەمە لەوانە : ئایا فیدراڵیەت وەك خیارێكی سیاسی لە عێراق پیادە دەكرێت ، ئەزمونی كوردی لە بزاڤە پەندۆڵییەكەیدا ، كورد لە گەمەی دەقە یاساییەكاندا.

جەوهەر نامیق پاش بە رێ كردنی تەمەنێك لە ژیانی چەكداری و سیاسی و پەرلەمانتاری و خۆ تەرخان كردن بۆ رەخنە گرتن و نوسین لە ٢٢/٣/٢٠١١ لە وواڵتی سوید بە نەخۆشی شێرپەنجەی جگەر كۆچی دوای كرد و پاشتر لە بەشێك لە راگەیاندنەكانەوە گومان لەسەر مردنەكەی دروست بووە ، دوو كوڕ و كچێكی لە پاش بە جێ دەمینێ ، پاشتر لە رێ و رەسمێكدا تەرمەكەی هێنرایەوە بۆ زیدی خۆی لە بەرلوت لە گەرمیان و لە رێ و رەسمێكی شایستەدا بە خاك سپێردرا . لە ١٧/٤/٢٠١٢ لە گۆڕستانی بەرلوت لە ساڵیادی كۆچی یەكەمین سەرۆكی پەرلەماندا رێو رەسمێك بە ئامادەبوونی ژمارەیەك لە بەرپرسانی حزبی و حوكمی بەڕیوە چوو .

-

# جەلال بیلال
# یەکەم قائیمقامی کەلار




- **ن: سەباح عەلی جاف**

جەللا بیلال مستەفا پیرەبابی : ( ١٩٢٣ – ١٩٩٣ ) لە شاری هەولێر لە دایك بووە و بنەماڵەکەیان بنەماڵەیەکی ناسراوی ئاینین و سەرەتای خوێندنی لە حوجرە بووە ، قوناغەکانی خوێندن لە شاری هەولێر تەواو دەکات و پاشان چوتە کۆلێژی ماف لە بەغداد و بەسەرکەوتوی تەواوی دەکات ، لە ساڵی ١٩٤٦ پاش تەواو کردنی زانکۆ دەبێتە بەڕێوەبەری ناحیەی قادر کەرەم و پاشان دەبێتە بەڕێوەبەری ناحیەی سەرقەڵا ( شێروانە )ی سەر بە قەزای کفری ، پاشتر چەندین پۆستی تر وەردەگرێت و بۆ ماوەیەکی زۆر لە گەرمیان دەمێنێتەوە ، لە ١٩٧٠/٢/٢٨ - ١٦ی ئەیلولی ١٩٧١ دەبێتە قائیمقامی قەزای کەلار ( یەکەمین قائیمقامی کەلار ) گەلێك خزمەتی لە قەزاکە لەو ماوە کەمەدا کردووە ، ڕۆڵی هەبووە لە بواری پەروەردە و فێربوون و کردنەوەی قۆناغی ناوەندی بۆ قوتابیانی شارەکە ، مامۆستا عەبدوڵڵا حەسەن قادر لە ساڵی ١٩٧٠ دا قۆناغی سەرەتای تەواو دەکات و بۆ کردنەوەی ( قۆناغی ناوەندی ) ئەو پاشکۆیە باس لەوە دەکات بە یاداشتی کۆمەڵێك قوتابی ئەو پاشکۆیە کراوەتەوە و لەم ڕووە بەم شێوەیە باسی ئەو پاشکۆیە دەکات " من و شێرکۆ محەمەد ڕۆستەم چوین بۆ قائیمقامیەتی کەلار بە

پاسەوانەکەمان ووت ئەمانەوێت چاومان بە قائیمقام بکەوێت ووتی ئیشتان چیە و دەتانەوێت چی پێی بڵێن ، پاشتر چوین و (جەلال بیلال ) مان بینی دەمەو ئێوارە بوو ، ووتی : چیتان دەوێت ووتمان ئێمە وەك قوتابیانی کەلار دەمانەوێت لە کەلار بخوێنین و ناوەندیمان بۆ بکەنەوە ، ئەویش بانگی کاتبەکەی کرد و ووتی مەزبەتەك بنوسە و بزانە چیان دەوێت " بەم شێوەیە دەردەکەوێت جەلال بیلال رۆڵی لە کردنەوەی ئەو پاشکۆیەدا هەبووە لە کەلار.

ئەم پیاوە ئیداریە پاش تەمەنێك لە خزمەت بە رووی داوی هاتوچۆ لە ١٤ ی ئەیلولی ١٩٩٣ کۆچی دوای دەکات و لە بەغداد بە خاك دەسپێردرێت .

**سەرچاوە:**

* الوقائیع العراقیة ، الجریدة الرسمیة للجمهوریة العراق ، عدد ( ١٨٥١) ، ١١/٣/١٩٧٠ .
*ئەحمەد باوەڕ ، جەلال بیلال مستەفا پیرەبابی ١٩٢٣- ١٩٩٣ یەکەم قائمقامی قەزای کەلار و رۆڵی لە بواری کارگێڕیدا ، گۆڤاری زانکۆی گەرمیان ، ژمارە ( ٣ ) ، ساڵی ٢٠١٤.
*چاوپێکەوتن لەگەڵ مامۆستا عەبدوڵڵا حەسەن قادر ، کەلار ، ٧/٢/٢٠١٤ .
*قائیمقامبەتی قەزای کەلار ٢٠١٤ .

# بەشێک لە
# شاعیر و کەسە دیارییەکانی دەشتی شێروانە





- نووسینی : ساڵح هەلاج

ئەوەی لە مێژوودا وتراوە دەشتی شێروانە لە باکورەوە گونەکانی: بەردەسور، قاسم ئاغا، سەید خەلیلەکانن. لەباشوورەوەتانزیکی گوندی شێخ لەنگەر. لە خۆرئاواوە دەشتەکانی شاکەل. ، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕووباری سیروان....

**ئەم پانتایە لەکۆندا پێی ووتراوە دەشتی شێروانە.**

ناوچەکە مێژوویەکی کۆنی هەیە، بەتایبەتی پاش شەڕی جەلەولا لەنێوان سوپای ئیسلام و ئیمپراتۆریەتی ساسانی ئەم ناوچەیە مێژووەکەی نامێنێ تاپاش شەڕی چاڵدێران، لە نێوان صەفویە ئێرانییەکان و عوسمانییە تورك نەژادەکان لە ساڵی ١٥١٤زایینی.

بێگومان ئەو قۆناغە دوورو درێژە شاعیر و حیکایەت خوان و بەیتەهەڵبەست و هۆرە چڕومەقامزان و ژن و پیاوی کارامە و لێهاتووی باشی تێداهەڵکەوتووە.

ئەوەی لە ئەرشیفی ئێمە دەست دەکەوێت:

## دانش:



ڕەزابەگی جاف کوڕی فەتاح بەگی کوڕی حەمە پاشای جافە،ساڵی ١٨٨٨ لە ناو قەڵای شێروانەدا لەدایك بووە،ساڵی١٩٤٢ لە تەمەنی ٥٤ ساڵیدا کۆچی دوایی کردوە. کەشکۆڵێکی شیعری شاعیرانی کوردی هەبووەو خۆشی شاعیر بووە.لەشارە دێی سەعدییە بەخاك سپێراوە. شیعرێکی لەگەڵ شیعرێکی تاهیربەگی جافدا تێهەڵکێش کردووە.

## محمود پاشای جاف:



کوڕە گەورەی حەمە پاشای جافە، لەساڵی١٨٤٦یزاینی لەدایك بووە، هەربەمنداڵی لای (مەلامەئمون) ناوێك تاڕادەیەکی باش خوێندوویەتی و زمانەکانی فارسی و هەندێکی زمانی عەرەبی خوێندووە، بەهۆی تێکەڵا بوونی لەگەڵا تورکە عوسمانییەکاندا فێری زمانی تورکیش بووە.

یەکەم: کەسایەتیەکی سیاسی بووە وە لەنێوکایەکانی عوسمانی و قاجاریەکاندا، کەشکۆ لێکی هەیە شیعری زۆری شاعیرانی کوردی تێدا کۆکردۆتەوە و سەلیقەیەکی خەت نووسیی جوانی هەبووە، هەڵبەت خۆیشی شاعیر بووە، ساڵی(١٩٢١)لەتەمەنی (٧٥)ساڵی دا کۆچی دوای کردوە، لەمزگەوتەکەی خۆی لە قزڕەبات(سەعدیە) بەخاك دەسپێرێت.

## شێخ ئەحمەدی شاکەلی:





(کوڕی شێخ محەمەدی شێخ سعید)ە ڕووتەی شاکەلە، ساڵی (١٩٠٢)ی زاینی لەدایك بوە، هەرلە گوندەکەی خۆیان خراوەتە بەر خوێندن، زمانەکانی عەرەبی و فارسی ی زۆر بەباشی زانیوە و ئاشنایەتی لەگەڵا شیعری(کلاسیك) هەبووە، ئەندامی حیزبی هیوا بووە، شاعیرێکی ناوداری کوردستانە ساڵی(١٩٨٢) لەتەمەنی (٨٠)ساڵی کۆچی دواییکردووە، چەند جارێك دیوانەکەی چاپ کراوە دواترینیان ساڵی٢٠٠٩ نووسەر هاشم کاکەیی ساغکردنەوەو پێشەکی بۆ نوسیوە و لە دووتوێی (٤٣٢)لاپەڕەدا چاپکراوەتەوە.

## غالب شاکەلی:

ناوی شێخ عەلی کوری شێخ مەحمودی کوڕی شێخ سەعیدە، ڕووتەی شاکەلە، ناز ناوی غالب شاکەلی بووە، ساڵی (١٩٠٨) لەگوندی شاکەل لە دایك بووە لە حوجرەی فەقێ فێری خوێندن بووە، تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، پاشان وازی لەمەلایەتی هێناوە و خەریکی کاری کشتوکاڵی بووە ساڵی (١٩٤٨)

لەتەمەنی چل و چوار ساڵیدا کۆچی دوایی کردوە، شیعرەکانی فەوتاون، تەنها سێ شیعری لە پاش بە جێماوە،

لە ( کەشکۆڵی شاکەلی ) کۆکردنەوەی (شێخ سلێمانی شاکەلی) نووسراوەتەوە.

## مینە جاف:



ناوی حەمە ئەمینی کوڕی کەریم بەگی فەتاح بەگی حەمە پاشای جافە، لە ساڵی(١٩١١)زاینی لە قەلای شێروانەی کەلار لە دایك بووە، زمانی فارسی عەرەبی تورکی بە باشی زانیوە،لە ساڵی(١٩٦٥) کۆچی دوایی کردووە، لە پاش مەرگی دیوانەکەی لە دوو توێی(٣٠٠) لاپەڕەدا لەلایەن خوالێخۆشبوو مستەفا نەریمان لە ساڵی(١٩٩٠) چاپ کراوە

## حاجی برا یمی شاتری:

کوڕی حاجی محەمەدی کوڕی مەحمودی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی مەنسوورە لە هۆزی گەورەی جاف و سەرۆکی تیرەی شاتریە، ساڵی (١٩١٩)زاینی لەکاتی کۆچەرایەتی گەرمیان و کوێستان لە دایك بووە، زمانی عەرەبی و فارسی و هەندێ تورکیشی زانیوە، دووديوانی بەناوی

١ـ دیوانی جاف.
٢ـ(کۆچ و بار و گەڕانەوە) چاپکردووە،
لە ڕۆژی ١/٤/٢٠٠٠ کۆچی دوایی کردووە.

## عزەدین:



کوڕی (فارس حەسەن خاتوون)ە ساڵی (١٩٢٦) لە گوندی عەلیانی سەروی ناوچەی زەنگەنە لە دایک بووە، پاشان ماڵیان هاتۆتە گوندی گۆپان، لە (١٩٨٤/٧/١٨) لەکەلار کۆچی دوایی کردووە.



## ئەحمەد کەلاری:



کوری (مەحمود علی محەمەد)ە ساڵی ١٩٣٥ی زاینی لە گوندی کەلاری کۆن لە دایك بووە، پیاوێکی سیاسی و شاعیرێکی بە سەلیقە بووە، دیوانێکی شیعری هەیە تاکو ئێستا بڵاونەکراوەتەوە، ڕۆژی١٠/٣/٢٠٠٨ کۆچی دوای کردووە.

## عەبدوڵا گۆبانی:



(عەبدوڵا عزیز فەتاح) ساڵی (١٩٤٧) لە گوندی گۆبانی ناوچەی گەرمیان لە دایك بووە. دیوانێکی شیعری هەیە، لە ڕۆژی (٢٠٠٠/١١/١٤) لەتەمەنی (٥٣)ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

## نەبەرد جاف:



کوڕی حەمە سعید بەگی کوڕی حەمە بەگی کوڕی فەتاح بەگی حەمە پاشای جافە. ساڵی (١٩٤٨) لە شاری کەلار لە دایك بووە، قۆناغەکانی خوێندنی لە کەلار و خانەقین و بەغدا بە سەرکەوتوی تەواو کردوە، لە ١٩٩٢/٢/٩ لە تەمەنی ٤٤ ساڵیدا کۆچی دوای کردووە.

نەبەرد جاف تالە ژیاندا بوو ئەم بەرهەمانەی بە چاپ گەیاندووە:

١ـ هەرگیز ناڵێم پەشیمانم، شیعر١٩٨٨ نەرویژ.

٢ـ بارانی مەرگ، شیعر١٩٨٨ نەرویژ.

٣ـ چروستانی، شیعر١٩٨٨ نەرویژ.

## محەمەد پەژار:



حەسەن ئەحمەد ساڵی ١٩٥٤ لەکەلاری کۆن لە دایك بووە، ١٩٩١/٣/٢٥ بەدەستی چەکدارانی موجاهیدی خەڵکی ئێران لەکەلار شەهید کرا.

لەپاش خۆی دووجار بەرهەمەکانی چاپ کراوە، لەلایەن نووسەر: سەرکۆ مەحەمەد ڕۆستەم و ماموستا ئەحمەد باوەڕەوە.

## شەهید مەلا ئەحمەد:

کوڕی حەمە ئەمین شەریف نازناوی شیعریی(ئەحمەد باوەڕ) بووە ساڵی ١٩٥٨ لە کەلاری کۆن لە دایك بووە، لە سەردەمی پارتیزانیدا لە ١٩٨٩/٢/١٩ خۆی و شەش هەڤاڵی تری ئەشکەوتی (داری خلە) هەرەسی کرد بەسەریاندا و شەهید بوون. شاعیرێکی بە سەلیقە و جوان نووس بووە، بەداخەوە ئەو هەموو ووشە جوانانە کەوتنە ژێر هەرەسەوە ئەوانیش شەهید بوون.

## حەمە سەعید بەگی جاف:



کوڕی حەمە بەگی فەتاح بەگی حەمە پاشای جافە، لەساڵی ١٩٢٦ لە کەلار لە دایك بووە، لە چلەکان دەبێتە ئەندامی حزبی هیواو پاشان لە گۆڤارەکانی (گەلاوێژ و هیوا) دا دەست دەکات بە نووسین و وەرگێڕانی بابەتی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی ساڵی ١٩٩٦ لە تاراوگە کۆچی دوایی کردووە.

## داود بەگی جاف:



کوڕی فەتاح بەگی کوڕی حەمە پاشای جاف. ساڵی ١٩٠٥ لە گوندی میرە دێی شارە زوور لە کاتی گەرمیان و کوێستانی جافدا لە دایك بووە. یەکێك بوو لە جەنگاوەرانی شێخ مەحمود لە شەڕی ئاوباریك، سەرەڕای ئەویش (٩)جار بە ئەندامی پەرلەمانی عێراق هەڵبژێردراوە، ساڵی١٩٦٦ لە ئێران کۆچی دوایی کردووە.

## کەریم بەگی جاف:



کوڕی فەتاح بەگی کوڕی حەمە پاشای جاف. ساڵی(١٨٨٩) لە وارگەی گردەبانی لای تازەدێ ی گەرمیان لە دایك بووە، دۆستی شێخ محمودی مەلیك بووە، لە شەڕی ئاوباریك بە شداری کردووە، یەکەم کەس بووە مێژووی هۆزی جافی نووسیوەتەوە، کۆمەڵێ شیعری هەبووە لە کەشکۆڵێکدا تۆمارکراوە، ڕەمەزانی ساڵی١٩٤٩ لەتەمەنی ٦٠ ساڵی کۆچی دوای کردووە.



## محمد کریم قوباد:

محمد کریم قوباد لە تیرەی پشدەری گەلاڵی، ساڵی ١٨٩٧ لە دایك بووە، پیاوێکی تێکۆشەر و ناوداری گەرمیان بووە لە هاوکارانی (داود خانی کەڵهور) و یەکێك بووە لە چەکدارەکانی کانی شێخ مەحمود، لە هەموو شەڕ و چالاکییەکانی ئەو بزوتنەوەیەدا بەشداری کردووە، شێخی نەمر زۆر باوەڕی پێبووە خەنجەرەکەی خۆی پێشکەش کردووە، تا کۆتایی بزوتنەوەکە بەشداری کردووە و باسی سەدان ئازایەتی و لە خۆبوردووی کراوە، پاش کۆتایی‌شۆر َشەکە ئینگلیزەکان بە تەواوی دەستیان گرتوە بە سەر عێراق و کوردستاندا، ئینگلیزەکان مووچەیەکیان بۆ بڕیوەتەوە (حق السکوت) بەڵام ئەو مووچەیەی وەرنەگرتوە و بە خیانەتی زانیوە، ساڵی ١٩٩١ لە تەمەنی (١٠٤) ساڵیدا کۆچی دوای کردووە.

# مانگرتووان
# فۆرمێکی تری خەباتی مەدەنی لە کەلار



• باوکی ژیوار

شاری کەلار لە سەرەتای دامەزراندنیەوە جوڵەی کۆچ وگەشەکردنی دانیشتوان ، هێندەی تر جوانی و داهێنانی خوڵقاند ، شارێك پڕ لە بزاوتی جۆراو جۆر ، ئەکتیف لە کۆی کایەجیاوازەکاندا ( ڕۆشنبیری ، هونەری ، وەرزشی ٠٠هتد ) ناوەڕاستی هەشتاکان وتاکۆتایی چەند تیپێکی شانۆ و مۆسیقا هاتنە دامەزراندن ، هەر لەو ساتە وەختەدا گەورەترین خۆپیشاندان ئەنجام درا ، کە گاریگەری زۆری هەبوو لە ڕووی سیاسیەوە کە دروشم وهوتاف گەلێك بە زمانی کوردی وعەرەبی دەنووسران ودەخوێنرانەوە ،ئەمانەو زۆری تریش ڕەنگە لێرەدا دەرفەت نەبێت ئاماژەی پێبکرێت ، لەم شارەدا جۆرێکی تر لەخەبات وچالاکی مەدەنی هاتە کایەوە ،ئەویش خۆپیشاندان و مانگرتووانی کۆمەڵێك لەچین وتوێژەکانی کۆمەڵ بوو ،لەبەردەم ماڵی ( مستەفا بەگی جاف ) دا کە لەو ساتەوەختەدا نوێنەرایەتییەکی ڕێکخراوی (un) ی تیادابوو ، جگە لە دانیشتوانی کەلار ودەوروبەری خەڵکی شاری کفری ودەربەندیخانییەکی تیادابوو هەرچەندە سلێمانی وهەولێردەست پێشخەر بوون، داواکاری مانگرتوان ئەوبوو ناوچەکە بپارێزن لە سوپای دڕندەی عێراق وکەلاریش بخرێتە ناوناوچەی دژە فڕینی سەرووی

هێڵی پانی (٣٦) وناوچەی ئارام ، تاژیانی زۆرترین كەس لە هەڕەشەی هەڵگیرسانەوەی جەنگ وشەڕ فرۆشتنی عێراق ڕزگار بن ، هەروەها گەڕانەوەی ئاوارەكان ولابردنی ئابلۆقەی ئابووری لەسەر كوردستان ، لە سەر زەمینیش ناوچەی ئارام بیگرێتەوە بەم دروشمانە دەستیان پێكرد:

یو ئێن وەرە دەرەوە
وەڵامان بدەرەوە
هێڵی ٣٦و ٣٤
ئاواتی كوردی هەژار
سەدرەدین ئاغا خان
Please Com to Kurdistan

ڕەنگە ئەم دێڕانەی سەرەوە لای هەندێك زۆر نامۆ بێت ، وەلای هەندێكی تریش فلاش باكێك بێت بۆ ڕۆژانی دوای ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ ، دوابەدوای شكستەكەی حكومەتی عێراق بڕیاری كشانەوەی دامودەزگاكانی لە كوردستان دا ، بەشێوازێك ئیدارات كشایەوە ، بەڵام سووپا بوونی مابوو ، ڕێكخراوی ( یو ئێن ) بارەگایەكی لە شاری كەلاردا هەبوو ، لەوساتەدا هێڵەكانی پانی ٣٦ و٣٤ درووستكرا ، ووتیان لە سلێمانی خەڵك مانیگرتووە لە خواردن وخواردنەوە، چوونە بەردەم بارەگای (un ) بەبێ یەك ودوو كۆمەڵێك كەسی خۆنەویست چوونە بەردەم ماڵی مستەفابەگ و مانگرتنیان ڕاگەیاند ، ئێمەمانان وخەڵكێكی زۆر ڕۆژانە هەر لە بەیانی زووە تاكو نزیك نیوەی شەو دەچووینە ئەوێ ، یەكێك بە شیعرو یەكێك بە پەخشان و هەندێكی تربە ووتاری حەماسی ، هونەرمەندانیش بە گۆرانی و بە شانۆ مەنسەكە بەرنەدەكەوت ، وە زۆرێك چیرۆكی كارەساتی ئەنفالیان دەگێڕایەوەوە خەڵكی پاشماوەی ئەو كارەساتە لە ناحیەی (صمود) ەوە دەهاتن بۆ كەلار ، هاوكات لە دەربندیخان وكفری وخانەقی و باوەنوورو زەندئابادە بەشداربوون، دەتوانین بڵێن لە دوای ڕاپەڕین لە كەلار ئەمە یەكەم هەنگاوی خەباتی مەدەنی بوو ،ئەو دەمە یەكێك لەو دروشمانە كە ڕۆژانە سەدان جار دەمانووت :( یوئین وەرە دەرەوە٠٠ وەڵاممان بدەرەوە ) چونكە بارەگاكە دوو كارمەندی یوئینی تێدابوو لەوكاتەشدا ، سەر قەڵای شێروانە سوپای عێراقی لێبوو ، وە لەگەڵ چەند مودەڕعەیەك ڕوویانكردبووە ئاراستەی خەڵكەكە،جا ڕۆژێكیان یەكێك لەو كارمەندانە هاتە دەرەوە بۆ ناو خەڵكەكە كابرایەكی ڕەشپێست بوو ووتی ئێوە چیتان لە ئێمەدەوێت :من و هاوڕێكەم پۆلیسێكی ئاسایی یوئێنین وە ناشتوانین هیچتان بۆ بكەین (١) ، دوای ئەوەی لە ڕادیۆی گەلی كوردستانەوە هەواڵمان بیست لەسلێمانی چەند گەنجێك لەبەردەم نوسینگەی ( un ) دا هەستاون بەچالاكی مانگرتن لەخواردن وخواردنەوە ، تەنانەت بێژەرەكە لەبری ئەوەی بڵێ ئێرە دەنگی گەلی كوردستانە دەیووت ( ئێرە دەنگی مانگرتووانە ) ئەو حەماسە وای لێمان كرد ، هەر ئەو ئێوارەیە لەگەڵ چەند كەسێك بچینە بەردەم بارەگای یوئێن لە كەلار ، بڕیاری مانگرتنمان دا وهەر ئەو ساتە هەواڵەكە بەهەموو كوردستاندا بڵاوبوویەوە ،ئەو كاتە تەمەنم (١٦) ساڵان بوو ، چەندین چالاكی جۆراو جۆر ئەنجام دەدرا ، بۆبەرزكردنەوەی وورەو بەشداری كردنی ئەو دڵسۆزانە كە لە پێشمەرگەی دێرین وزیندان سیاسی وهونەرمەند وشاعیرو ڕۆشنبیری ناوچەكە بوون ، هەرچەندە دەستەیەكی ڕاگەیاندن هەبوو ئەوانە

بەردەوام لای ئێمە بوون لوڕێگەی ئەمانەوە ڕیزبەندی دادەنرا بۆ بەشداریکردن ،هەڵەنەبم من بچووکترین مانگرتوو بووم ، ئەوەش وای لە کەس و کارو خزمانم کرد ، کە لێم دوورنەکەونەوە ، یەکێك لە داواکانمان دەستنیشان کردنی ناوچەیەکی ئارام لەباکووری عێراق کە کۆی باشووری کوردستان بگرێتەوە ،ببێتە ناوچەی دژە فڕین و لەژێر پارێزگاری هێزەکانی هاو پەیماناندا بێت ، ناخۆشترین شەویش بارانێکی لێزمە بوو زۆر ساردو ئاو هاتە ناو چادرەکەمانەوە ، هەموو تەڕبووین لایلۆن و جلی ووشکیان لەماڵەوە بۆ هێناین ، کارمەندێکی یوئێن هاتە دەرەوە گەلێ دڵخۆش بووین ووتمان پێدەچێ بۆ ئەوە هاتبێتە دەرەوە ئێمە ببەنە ژوورەوە یان هەواڵێکی خۆشیان پێبێت ، بەپڕتاو سەگەکەی خۆیان بردە ژوورەو ئێمەیان پشت گوێ خست ، (٢) محمد سابر زەنگەنە دەڵێ : ئێمە لەشاری کفرییەوە هاتین ،هەفتەیەك لە کەلار ماینەوە و مانمان گرت دواتر ، بۆپشتگیری سلێمانی بەپێ کەوتینە ڕێ عەسر بوو ، شەومان بەسەردا هات گەیشتینە دەربەندیخان وبەردەوام بووین تا کاتژمێر (١٠) بەیانی گەیشتینە مانگرتووانی سلێمانی ، ئەوان هەموویان لە ناو تابووت بوون و گوڵ باران دەکران لەگەڵ un چاوپێکوتنمان کرد، کاکەم (مامۆستا عەبدوڵڵای زەنگەنە ) وەرگێڕی زمانی ئینگلیزی بوو ، دواتر ئێوارە گەڕاینەوە بۆ کەلار بۆلای هاوڕێیانمان ودرێژەمان دا بەمانگرتن ، دوای کۆتایی هاتن بە ئامادەبوونی جەماوەرێکی زۆر هەریەکەو بەڕێکرا بۆشاری خۆی ، بەڵام زۆرمان بێهێز بووین دەبووراینەوە براینە نەخۆشخانەی کەلار موغەزیمان بۆ هەڵبەسترا ، کەکەیشتینەوە کفری لەبەردەم کۆمیتەدا پێشوازی کەرمان لێکرا بەشیعرو هوتافەوە ، لە مانگی (١٢) ەی ١٩٩١ دا سەرەتا لە سلێمانی مانگرتن دەستی پێکرد ،ئێمەش لەکەلار دوای سلێمانی دەستمان پێکرد لە پێش نیوەڕۆدا، شێوازی مانگرتنەکە وا بوو ،کە هەر کەسێك دەچووە ئەو دیووی پەتەکەوە دەیگووت مان دەگرم پێمان دەگووت: قورس وگرانە ئەگەری مردن هەیە چونکە هیچ ناخۆیت وناخۆیتەوە ، تەنانەت ئاویش بۆیە هەر برادەرێك کە دەچووە ئەودیوو پەتەکە وەك ئەوە وا بوو پەتی سێدارەی لەمل کردبێ ،ئەم مانگرتە بە دوو شێواز بوو یەکەم کۆمەڵێ کەس بەردەوام بوو لە بەردەم بارەگای (un) لە کەلار کە ئەمە لە پێشدا کەمبوون بەڵام ڕۆژانە زیادی کرد، لە کۆتایدا گەیشتە ( ٣٨)کەس، دووەم ڕۆژانە کۆمەڵی گەنج دەهاتن پەیوەندیان دەکردە بە مانگرتووانەوە، چەندکاتژمێرێك یان شەوێك دەمانەوە دواتر بەڕێ دەکران بۆ سلێمانی ، هەروەها چەند کەسێکی بە هەڵوێست سەرپەرشتی ئەم مانگرتنەیان دەکرد بەڵام ئەمان مانیان نەگرتبوو، ڕۆژانە جەماوەرێکی زۆر لە پیاو و ژن لە کەلار وڕزگاری و دەوروبەری دەهاتن بۆ پشتیوانی و تا درەنگانێ شەو نەدەڕۆیشتنەوە ( بەڕاستی حەماسیەتی کوردایەتی بوو )من دەمەوێ چەند شتێك لێرەدا باس بکەم بۆ مێژوو، زۆر کەس بۆ مردن هاتبوون ئامادەبوون لە بەردەم دەرگای ( un)دا لە پێناو خواستی کوردا بمرن، بەڵام هەندێك خەڵکیش هەبوو تەنها دوای حەماسەت کەوتبوون ، من لێرەدا ئەوەی لە بیرم ما بێت بە پێی توانا باس دەکەم بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك هیچ شتێکمان نەخوارد تەنانەت ئاویش ئەمە ڕێك ئامادە بوون بوو بۆ مردن ، وامان لێ هاتبوو نەمان دەتوانی بە پێوە بوەستین،کاك (زیادحەمە ڕەشید ) دوو جار هەوڵی خۆ کوشتنی دا جارێکیان نەوتی کرد بە خۆیدا جارێکیش خۆی فرێدایە ژێر سەیارەی (un)وە،هەروەها چەندین کەسمان لە برسا بوورایەوە من خۆم جلێکی وا لەبەردا نەبوو کە بەرگەی ئەو سەرمایە بگرێ ، داوای قەمسەڵەیەکم لە خزمێکم کرد بۆی هێنام( un), پێیان ووتین یاسای مانگرتن وا نی یە، هیچ نەخۆی بەڵکو دەتوانی ڕۆژانە چایەك یان قاوەیەك بخۆی ، کۆتا ڕۆژیش لە

دوای بڕیاری لیژنەی سەرپەرشتیار چەند کاتژمێرێك مانمان نەشكاند تا دڵنیایان كردینەوە لە گەیشتنی پەیامەكەمان ، مانگرتووان ناسنامەیان بۆ كراوە دیووی یەكەم ، لەسەرەوە ناسنامەی مانگرتوانی گەرمیان ،ئەم زانیارییانەی تیایە ، وێنەی مانگرتوو ناوی سیانی وتەمەن و ناونیشان وگرووپی خوێن ،لە خوارەوە سەرپەرشتی گشتی واژۆی كردووە، لەسەر مۆرەكە ( بە زمانەكانی كوردی وعەرەبی وئینگلیزی نوسراوە یەكێتی نیشتمانی كوردستان بەخەتی سوور ئەستێرەیەك لەناوەڕاست نوسینەكەدایە ) بەبێ ئەوەی ناوی سەرپەرشتی گشتی لەسەر بێت ، ڕوی پشتەوە نوسراوە خۆمان دەكەینە قوربانی بۆ بەختەوەری گەل ونیشتمان هەمان مۆرو واژۆی لەسەرە

١-چاوپێكەوتن : مامۆستا شێروان محەمەد غەریب

٢ -چاوپێكەوتن : مڵكۆ ئەحمەد كەریم

٣ -چاوپێكەوتن : مكایل ئەحمەد كەریم

٤ -چاوپێكەوتن : محەمەد سابیر زەنگەنە

- زۆر بەڕێزی تر لەم چالاكیەدا بەشدار بوون لە بوارەكانی تردا ( ڕاگەیاندن ، ئیدارە ، وەرگێڕان ، تەندروستی ، چاودێری ) ئەمانەش كۆمەڵێك دڵسۆز بوون زۆر ماندووبوون ، بۆیە داوای لێبووردن دەكەین سانا نیە لێرەدا بتوانین بێ كەموكوڕی دەرباز بین ،بۆیە دەڵێن كارێكە دەكرێ لە ئایندەدا بەهەموومانەوە ، دەوڵەمەندی بكەین ، دیسانەوە بمانبەخشن لە كەموكوڕی ٠





**ئەرشیفی:( ئازاد علی رشید و كامران نەریمان)**

# هۆرە



- **عەبدوڵڵا حەسەن قادر**

هۆرە لق و پۆپ و شێوازی زۆرە ، هەرچەن شێواز و جۆرێ سەر بە ناوچە گەلێکی جیاوازە ، هەندێ جار هەوایەك بەناوی هۆرە چڕێکەوەیە،یا شارێك ، هۆزێك ناو نراوە ، وەك-:
هەیوانی چڕ ، برایم چڕ ، کەرگاچڕ ، قەڵغانی چڕ ،...هتد.
هەر شێوازێك چەند هەوایەکی لێبووەتەوە ، کە تایبەتە بە سەختی و شاخو داخ ، یا زەوی ڕاستایی و تەپۆڵکە، ئەمانە تایبەتمەندی داوە بە جۆری هەواکان ، بەرزو نزمی و یاری کردن بە لەرانەوە و ناخ و قوڵایی قورگ ، تا ناوچەکە دژوار و لوتکەی شاخەکان قوچ و شیوو و دۆڵەکان قوڵ بن ، ئەوەندەشهەواکان کە لە گەروی هۆرەچڕەوە دەردەچن قوڵ و تیژ و پڕ لەرینەوەن، وە بە پێچەوانەوە. بۆ درووستی ئەوانەی سەرەوە و جیاوازی سنوری ناوچەی جوگرافیای هۆرە ، دەتوانین هۆرە بکەینە پێنجشێوازی جیاوازەوە-:

١- شێوازی گوران
٢- شێوازی کەڵهوڕی
٣- شێوازی جافی
٤- شێوازی سۆز
٥- شێوازی مور.

**١ -شێوازی گوران:**

سنوری ناوچەی گوران و داڵەهۆ دەگرێتەوە ، شێوازی هۆرەكەیان قوڵ، هەڵسان و بەرز بوونەوەی تیژ و
باڵاو بەرزە چڕە ، دابەزینیشی هەروایە ، هەروەك سروشتی لوتكەی چیاو شیوو دۆڵەكانێتی.
سەر دەستەی هۆرەچڕانی ئەم شێوازە ئەولعەزیزی ڕەحمەتییە ،
لە هۆرە چڕە دیارەكانیشی-:

١- نسور ڕەزایی
٢- احمد سەفەری
٣- سلێمانی نەوروزی
٤- ئەسرین سەفەری
٥- یار كەرەم نەجەفی ...هتد.

**٢ -شێوازی كەڵهوڕی:**

تخوبی دەڤەری كەڵهوڕ و شارو دێهاتە كەڵهوڕ نشینەكان دەگرێتەوە شێوازی هۆرەی كەڵهوڕ كەوتۆتە بەر كاریگەری شوێنە جوگرافیەكەیان ، بۆیە هەڵسان و دابەزین و لەرانەوەی ناخی قوڕگیان ،
جگە لە عەلی نەزەری ڕەحمەتی تیژ و قوڵ بینە.
لەم شێوازەدا هۆنراوەی فۆلكلۆری كەڵهوڕی بەكار دێت.
سەر دەستەی هۆرە چڕانی ئەم شێوازە شاد ڕەوان عەلی نەزەرەی منوچەهرییە.
هۆرە چڕە دیارەكانی:

١- برایمی حسێنی
٢- سەی قولی
٣- ... هتد

**٣ -شێوازی هۆرەی جافی:**

هۆرە چڕانی جاف یان هۆزی جاف هۆرەیان لە ڕۆژهەڵاتەوە لەگەڵ خۆیاندا هێناوەتە ئەم دیوا ، بەڵام تام و بۆی هەوای ناوچەكە و بۆن و بەرامەی خێڵیان داوەتێ و جل و بەرگی كلتوری خێڵیان بەبەردا بڕیوە.شیعری هۆرە لە شێوازی جافیدا زۆربەی زۆریان جافین و گوزارشت لە گەرمیان و كوێستان ، خێڵ بەزین ،دڵداری و خۆشەوستی و دووری دەكەن ، جار جاریش شیعری كەڵهوڕیش بەكار دەهێنن.چڕینی هۆرە لەم شێوازەدا هەڵسان و دابەزینی تیژ و نییە ، وەك لە شێوازی گۆراندا هەیە.
هۆرە چڕەكانی ئەم شێوازە:

١- ئەوڕەحمانی صالح باقر
٢- حاجی فەتاحی حاجی احمد
٣- حمەی خەلیفە فەرەج
٤- حمەی ئەڵە

-٥ والی مێوەکە
-٦ برایمی حاجی ئەوڕەحیمی خەلیفە
-٧ کامران لەتیف عزیز دەروێش
-٨ خلف بەکر بایەفی
-٩ ئەرکان شێخ تەویلی
-١٠ صباح قاسماغە
-١١ حسن گەڵاڵی
-١٢ عەزیزی موحترم
-١٣ حاجی عەزیزی حمە کەچەڵ
-١٤ جمال جبار حسین (١)

**٤ -شێوازی سۆز:**

سۆز لە ئەنجامی بارێکی تایبەتە کە بەسەر دەروێشدا دێت ، ئەویش ئەو پەیوەندییە ڕۆحیەیە، یا ئەو هێڵە پەیوەندییە کە لە نێوان دەروێش و خواو پیرەکەیدا دروست دەبێ ، بە دەنگی بەرز بانگی لێبەرزدەبێت و بە شێوەیەکی دڵگیر و خەمناك لە قوڵایی دڵەوە بە خواو پێغەمبەر(د.خ) و شێخەکەی و ڕۆژی پەسڵان ، تەنیایی قەبر و حسابدا دەڵێت ، مرۆڤ دەبزوێنێ و دەیخاتە دنیایەکی ترەوە. سۆز شێوەیەکی تری هۆرەیە ، بەڵام ئەم وشەو شیعرەکانی ئاینین و سۆزی ئاینی تێدایە ، مرۆڤ لەناخەوە دەبزوێنێ ، زۆرجار سۆزکەر و گوێگریش دێنە گریان ، لە سۆزدا ناوی خوا زۆر دێت ، دەروێش وەك پەیامێك داواکاری و پێویستیەکانی بەرز دەکاتەوە و هاوار دەکات.

**٥-شێوازی مور:**

(( وشەی (مور) لە ئاوێستادا (مئور)ە ، لە پەهلەوی ئەشکانیا (مئوزك)ە ،لە پەهلەوی ساسانیا (مویك)ە ، وە لە زبانی دەریدا (مویە) یە ، لەمڕۆشدا بە ( مویە) ناسراوە . (٢)

(مور = سەربۆرە) بۆ دەربڕینی هەستی غەمناکی و یادە پڕ شکۆکانی ڕابردوو بە ئاوازی غەمگین لە لایەن
ژن و پیاوە (سەربۆرە) چرەکانەوە دچڕسـَت .)) (٣)

(مویە) زیاتر تایبەتە بە هۆزی لەکەوە.

(مویە) ئەم جۆرانەی هەیە:

-١ مور دوو پوکیی
-٢ مور لافاوی
-٣ مور پاتەرمی
-٤ مور پاکوتەڵی
-٥ مور پاوەموری . (مور کزە چڕ ) (٤)

**سەرچاوەکان:**
١- ناوی هۆرە چڕەكانی هۆزی جاف لە بەڕێز مامۆستا صالح هاروونی وەرگیراوە
٢- نجف زادە قبادی امید علی (١٣٥١) ادبیات عامەلكی ،خُرم اباد ، انتیشارات شاپور خواست (١٣٩١)
٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو
٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو

**ناو: عەبدوڵڵا حەسەن قادر**
- **لە ساڵی ١٩٥٤ لە کەلاری کۆن لە دایك بووە**
- **ئەندامی لیژنەی فەرهەنگی تەقێ و فەرهەنگی کەلەپورە**
- **کتێبی (هاتو نەهات)ی لە چاپدراوە.**
- **لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بابەتی بڵاوکردۆتەوە.**
- **کۆمەڵێ چیرۆکی لە زمانی فارسی و عەرەبیەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.**
- **ئەندامی دەستەی نوسەرانی گۆڤاری ( کەلەپور و فۆلکلۆری کوردە).**
- **ئەندامی دەستەی نوسەرانی ڕژنامەی (گڕی نەورۆزە)**
- **ئێستاش سەرگەرمی فەرهەنگ نوسییە .**

# چیرۆكی هاتنە دنیای "بارین " یەكەم ڕۆژنامەی ژنانەی ئەهلی لە كەلار وگەرمیان


بارین

لە بارین دا

8ی مارس ڕۆژێك بۆ تەویادكردنەوە یان وێستگەیەك بۆ گۆڕان

سەرنووسەری بارین خەڵاتی چالاكترین ژنە ڕۆژنامەنووسی گەرمیانی وەرگرت

ڕێكخراوەكانی ژنـــــان لەكوێی حیزبەكاندان؟!

پاشماوەی قوربانیانی ئەنفال دژی پرۆژەیاسای وەزارەتی شەهیدان وئەنفالكراوەكان دەوەستنەوە

- **سوعاد حاتەم**

لە دوایی پرۆسەی ئازادی عیراق لە نیسانی ٢٠٠٣دا ڕۆژنامەنووسیی نووسراو لە گەرمیان و كەلاریش گەشە و گۆڕانی بەرچاوی بەسەردا هات ، چەندین ڕۆژنامە لە كەلار بە مەیل ومەشرەبی جیاجیا دەردەچوون ، ڕۆژنامەكان لەوەدا لەیەك دەچوون كە زۆربەیان گشتی بوون و زۆرتر كاریان لەسەر هەواڵ و ڕێپۆرتاژ و ڕاپۆرتی ڕۆژنامەوانی دەكرد و كەمتر فۆكسیان لەسەر خەم وخەونەكانی چین وتوێژێكی تایبەتی كۆمەڵگا بوو ، ئەمەش بۆ ئێمە چالاكانی ژنان كەخەمی گەورەمان كێشە وكەناركەوتنەكانی ژنان بوو لە كۆمەڵگای كەنارکەوتویی گەرمیانی وكەلاریدا جێی قبوڵ و ڕازی بوون نەبوو ، بۆیە هەر زوو كەوتینە خۆ و پلان وپرۆژەمان ئەوەبوو ژنانی گەرمیان لەم بزاوتە ڕۆژنامەوانیە جێ نەمێنن ، بۆ ئەمەش دوایی ڕاوێژ وگفتوگۆ لەگەڵ چەند قەڵەمێكی ژنانەدا هاتینە سەر ئەوەی لە قۆناغی یەكەمدا بە پاشكۆیەكی ژنانە لە ڕۆژنامەی كەناردا دەست پێ بكەین كە نزیكیمان لەگەڵ

خاوەن و نووسەرانی ئەم ڕۆژنامە گەرمیانیەدا هەبوو ، ئەوەبوو یەكەم ژمارەی ئەم پاشكۆ ژنانەمان لە سەرەتایی ساڵی ٢٠٠٦ دا لەگەڵ ژمارە "١٥"ی ڕۆژنامەی كەناردا بە ٤ لاپەڕە دەركرد ، لەوەبەدواش بەشەونخونی و هەوڵ وماندووبوونی چەند قەڵەمێكی ژنانەی ئازا لەناویاندا هەردوو خاتوون "پەیمان ئەمین و چنوور بەرزنجی" كە لەستافی نووسین لەگەڵم بوون شەش ژمارەمان لە "كەناری ژن" لە كەلار دەركرد و هەموو شوێن وئۆفیس وئیمكانیەتیەكیشمان دوكانە بچووكەكەی ناوەندی ڕۆشنبیر وپشتیوانی مادی ومەعنەوی خاوەن ئیمتیاز وسەرنووسەری كەنار "بێستون ژاڵەیی " و والی محەمەد وفەریق حەمەساڵح وستافی ڕۆژنامەكە بوو ، لەژمارە ٦ ی پاشكۆی كەناری ژنیشدا كە لەكانونی دووەمی ٢٠٠٧ دا لەگەڵ ژمارە ٢٠ ی ڕۆژنامەی كەناردا دەرچوو لەسەرەوەی لاپەڕە یەك و بەتەنیشت مانشێتی ڕۆژنامەكەوە نووسیمان "كەناری ژن دەبێتە ڕۆژنامەیەكی ئەهلی سەربەخۆی ژنان ،چ ناوێكی بۆ پێشنیار دەكەی ؟پەیوەندی بەم ژمارە وئیمەیلەوە بكە:" هەر لەو سەروبەندەدا لەڕادیۆی تایبەت بە ژنانی تەواردا لە كەلار و لە بەرنامەی "سەكۆی تەوار"ی ڕادیۆكەدا بۆ ماوەی ٤٥ دەقیقە لەگەڵ ڕۆژنامەنووس خاتوو جیهان محەمەد بەوردی دەربارەی ئەزمونی پاشكۆی كەناری ژن و ڕۆڵی ئەو چەند ڕۆژنامەنووسە ژنەی ئەو كاتە لە گەرمیان هەبوون قسەمان كرد ، هەر لەو بەرنامە ڕادیۆییەدا ئەو كاتە باسی ئامادەكاریەكانمان بۆ دەرچوواندنی یەكەمین ڕۆژنامەی ژنانەی ئەهلی لە گەرمیان وكەلار كرد كە ماوەیەك دوایی ئەوە لە ڕۆژی جیهانی ژناندا لە ٨ ی مارسی ٢٠٠٧ دا دەرچوو.

ڕاستیەكەی بۆ من لەدایكبوونی بارین ، وەك یەكەم ڕۆژنامەی ژنانەی ئەهلی لە كەلار وگەرمیان هەمان هەست وچێژی لەدایكبوونی بارینی كچمی هەبوو ، ژانی لەدایكبوونی هەردوو بارینەكەش هاوشێوە بوون ، ئێمە ڕەنج وهیلاكی زۆرمان بەدیار پیت بە پیتی بابەتەكانی هەرچوار لاپەڕە گەورەكەی ژمارە یەكی بارینەوە كێشا ، لەگەڵ دەرچوونی باریندا لیژنەی كاری هاوبەشی ڕێكخراوەكانی ژنانی گەرمیان خەڵاتی چالاكترین ژنەڕۆژنامەنووسی گەرمیانیان بە بەندە بەخشی ئەو ڕێزلێنان وخەڵاتە ڕەمزیەش بۆ من تا ئێستاش چێژبەخش وجێی شانازیە ، هەر ئەو كاتیش لە لاپەرە ١ ی ژمارە یەكی باریندا خۆم وتارێكم نووسی و ئاماژە و ڕەهەندەجیاجیاكانی ڕۆژی ٨ ی مارسم بۆ ژنانی كوردستان خوێندەوە و هەر لەو لاپەڕەیەشدا لە بەدواداچوونێكی رۆژنامەوانیدا دەربارەی شوێنی ژنان لە حیزبەكاندا گفتوگۆ وبەدواداچوونمان كرد ، لەلاپەڕە ٢ ی بارین یشدا دەربارەی ژن وڕاگەیاندن و ئەو كچانەی هاوڕێ كوڕەكانیان ژیانیان سوتاندن بابەتمان بڵاوكردەوە ،لاپەڕە ٣ ی ژمارە یەكی بارینیشمان تەرخان كرد بەچیرۆكی كچانەی بوكەڵە ، لەلاپەڕە ٤ یشدا لەپاڵ گۆشەكەی نزا كەلاریدا ، ساجیدە قادر لە دەستەی نووسەران و چەند نووسەری تریش بابەتی ژنانەی جۆراوجۆریان نووسی.

ژمارە ٢ ی بارینیشمان بە هەشت لاپەڕەی قەبارە گەورە لە نیسانی ٢٠٠٧ دا بڵاوكردەوە و زۆربەی بابەتەكانی ئەم ژمارەیەمان تەرخان كرد بە ئازارەكانی ژن لەتاوانی ئەنفالدا ، لەم ژمارەیەشدا هەردوو خاتوونی ڕۆژنامەنووس شەیما جەمال و ساجیدە قادر وەك دەستەی نووسەران كاری گەورەیان ئەنجام دا ، لەگەڵ دەرچوونی ژمارە ٢ ی بارینیشدا هەر ئەو كاتە و لە ٢٢ ی نیسانی ٢٠٠٧ دا لەگەڵ ڕۆژنامەنووسان "مەلاتەحسین گەرمیانی ولاوان ئەحمەد و هۆشیاری عەبدولعەزیز وكاروان یاروەیس وساڵح میروەیس " لەبەرنامەی سەكۆی تەلەفزیۆنی گەرمیانی یەكگرتوودا كە خاتوو بەهار ئەحمەد پێشكەشی دەكرد وتایبەت بوو بە هەڵسەنگاندنی ئەزموونی كاری ڕۆژنامەنووسی نووسراو لە گەرمیان

بە وردی باسم لە ئەزموونی كار كردنمان لە رۆژنامەی بارین كرد و خەم وكۆسپ وكێشەكانی ڕۆژنامەنووسی ژنانە و ڕۆژنامەنووسانی ژنم لە گەرمیان وكەلار خستە ڕوو.

لەژمارە ٣ ی بارێندا كە یەكەمین ڕۆژنامەی ژنانەی ئەهلی بوو لە گەرمیان و كەلار كە لە تەمووزی ٢٠٠٧ دا دەرچوو لەپاڵ ئێمەدا وەك خاوەن وسەرۆكی دەستەی بەڕێوەبردنی ڕۆژنامەكە خاتوو شەیما جەمال وەك بەڕێوەبەری نووسین دەست بەكار بوو . لەم ژمارەیەدا سەبقێكی ترمان كرد كە ژنانی ڕۆژنامەنووس و كەناڵ و ڕۆژنامەیەكی ژنانە پێشتر لە كەلار وگەرمیان نەیان كردبوو ،ئەویش بڵاوكردنەوەی ئەنجامەكانی ڕاپرسیەك بوو لەسەر ڕەوشی ژنان لە گوندەكانی گەرمیاندا كەوەك ستافی رۆژنامەكە ئەنجاممان دابوو ، لەو ڕاپرسیەدا ٥٠٠ فۆرممان لە ٣٠ گوندی گەرمیاندا دابەش كردو بەپێی ئەنجامێكی ڕاپرسیەكە ٦١% ی كچانی گوندنشینی گەرمیانی ئەوكات قەیرەبوون و ٩٦% ی ئەو دایكە گوندنشینە گەرمیانیانەش كە ئەو كات پرسیاریان لێ كراوە شوكردنی كچەكەت وژنهێنانی كوڕەكەت كامیان لەپێشترە وتویانە ژنهێنانی كوڕەكە خۆشتر ولەپێشترە!

گۆشەیەكی ژنانەی تر كە لە ژمارە ٣ وە زیادمان كرد گۆشەی بانیژەی خاتوو بەیان حەمەتاهیر بوو كە لەلاپەڕە ٣ ی بارێندا بڵاومان دەكردەوە ، هەر لەو ژمارەیەشەوە دكتۆرە گوڵاڵە گۆشەی تەندروستی "جەستەی ژن"ی بۆ دەنووسین.

ئەڵبەتە بەهەندێك گەڕانەوە بۆ دواوە ئەوە نابێ لەبیر بكەین كە ئازار ونەهامەتیەك كە ئێمەی ژنان لەسەروبەندی دەرچوونی ژمارە ٢ ی بارێندا لە نیسانی ٢٠٠٧ ڕووبەڕوی بووینەوە كوشتنی دڕندانە و سەنگەساركردنی دوعا بوو ، ئەو كچە یەزیدیەی لە ٧ی نیساندا بە ڕۆژی نیوەڕۆ لەناو شارۆچكەی باشیك دا لەلایەن كەس وكار و خزم وعێلیە بەردباران وسەنگەسار كرا ، ڕوداوەكە كوردستانی هەژاند وئێمەش لە بارین لە ڕێی خوشكە خۆبەخشەكانمانەوە ٣٥٠٠٠ سی وپێنج هەزار ئیمزامان بۆ بەیاسا تەحریم وتەجریمكردنی ئەشكەنجەدان و كوشتنی ژنان و بەدادگاگەیاندنی بكوژانی دوعا كۆكردەوە ، ئەوكات ئیمزاكان لە ڕێی خاتوو گوڵاڵەی گەرمیانەوە ئەندامی ئەو دەمی پەرلەمانەوە گەیەندرایە پەرلەمان وسەرۆكایەتیەكەی ، ئەڵبەتە كۆكردنەوەی ئەو هەموو ئیمزایە بۆ كەیسێكی تایبەت بەژنان وهەتا بۆ كۆی كاری مەدەنیش لەمێژووی كەلار وگەرمیانیشدا هاوشێوەی نەبووە.

بەداخەوە كە ڕۆژنامەی بارینیش وەك یەكەم ئەزموونی بیروبازووی پڕ هونەر وسەلیقەی ژنانە لە كەلار وگەرمیان دیسان مەحكوم بوو بەو بارودۆخە خنكێنەر ولەناوبەرەی كۆی حاڵەتی ڕۆژنامەنووسی نووسراو وكاغەزی لە ناوچەكە وكوردستانیش گرتەوە ، بۆیە ئەمیش دوایی چەند ژمارەیەك وەستا وكوژایەوە و وەك ئەستێرەیەكی ئاسمانی مێژووی ڕۆژنامەنووسی كوردستان وناوچەكە مایەوە و دەمێنێتەوە.



باریـن

ژمارە (پەنجاو...) ی 8 ی مارس 2007

# ئەو کچانەی هاوڕێ کوڕەکانیان ژیانیان سووتاندن

## ژن وراگەیاندن

## ئەو کورانەی دوای زەواج ئەڵقە لەدەست ناکەن

## نووسراوێکی بەڕێوەبەرایەتی تەندروستی گەرمیان هەرا دەنێتەوە

(بارین)

# مێژووی تیپی شێروانە



• خۆسرەو جاف

دێ ی کەلار پەنجاکان سەیربوو، تێکەڵەیەك بوو لەتایبەتمەندی لە جێگەو شوێنیتردا لەو شێوازە نەدەبینرا، نەشار بوو نەدێ، نەدەوڵەتی تێدابوو نەبەند و بنودی یاساکانی .... لەوێڕا سیستەم و بیروورِای خێلەکی و جارەو بار فکرێکی کاڵا و کرچی سەردەمانە لە یراو لەوێ دەبینرا وەنەبێ دەمار گرژی خێڵایەتی و ناوچەگەری تێدا نەبوبێت، جارەو بار ڕووداو ڕوویدەدا ئیتر ئەمە دزییە ، پیاوکوشتنە، ئاشوب و هەرای زەوی و زار و کێڵگە و لەوەڕگایە تەواوی ئەوانە لە لایەن بەگزادەکانەوە ئاسان دەکراو ئەو کەسەی پەنای بۆ یاسای دەوڵەت ببردایە بایەخی لە سیستەمی عەشایەری دەژمێردرا و جێگەی لە کەلاردا نەدەبوەوە.

لە بیرمە هەمیشە چوار پێنج بکوژی ڕاکردوو لە کەلاردا وەك پەنابەری تیایدا بوو دەوڵەت و دەسەڵات دەستی بۆ نەدەبردن، جگە لە ئەو بکوژانەی چەندین پەنابەری ڕاکردووی دەستی ( تحقیقات الجنائیە) ی ئەمنی بەغدای سەردەمی پاشایەتی و کابرا لە ندەهۆرەکەی ئەو دەمە (بهجت العتیە) لەکەلاردا بوون و لە ماڵی باوکی مندا نشتەجێ بون ئەوانەی ناوەکانیان لە بیرمە علی بەگی حسین بەگ، کەماڵی میرزا کەریم و چەن کەسێکی تر. لەبیرمە منداڵا بووم هەواڵ یان هێنا کەوا سبەیێ مەفرەزەی تەحقیقاتی جینائی دێن بۆ پشکنینی کتابخانەکەی باوکم بەڕێکەوت باوکم لە ماڵدا نەبوو دایکم هۆڵی

ئەوەی لێهات  چوون کتابە یاساکان لە ناو کتێبخانەکە وەدەرکەن. لەکەلاردا کەسێکی ئاوا شك نە دەبرا ئاگاداری کات و پەرتووکی مارکسی بێت..

دایکم کەوتبووە لیوە لەرەو ئەی خوا چیبکەم.

کابرایەکی ئێرانی تورك زمان لە ماڵی ئێمەدا زیاتر لە ساڵێك کرێکاری دەکرد، ڕوانی وا دایکم دەستە پاچەیە و دەرماندە هاتە پێشەوە و بە تورکی ووتی : خانم خۆت نارەحەن مەکە من دەتوانم ئەو کتابانە وا یاساغە دەست چنیان بکەم .

دایکم توورکی چاك دەزانی وڵامی دایەوە: ( گێت ـ گێت ) کابرا دەست بەردار نەبوو سور بو لە سەر قسەی خۆی، تا دایکم ووتی: باشە تو یەکی قورکاری کەری ئازەری لە کوینەوە ئەو کتابانە دەناسی.؟

علی تورکە وەڵامی دایەوە: خانم من برایەکە هەیە لەو بابەتە کتاوانەی دەخوێندەوە بو من ئەو ناوانە نامۆ نین. ئەمە شەوە..لوکسیان هەڵگرد و  ڕۆشتنە ناو کتاوخانەوە کە لوکس بەرز دەکرایەوە سەرم نەیدەدا لەبنی لوکسەکە ئەوەندە مناڵا بوم.. لە چارەکە کاتژمێرێکدا تەواوی کتاوە قەدەغەکراوەکانی وە دەرهێنا.

دەرکەوت علی تورکە ی ناوبراو تمەز سکرتێری تودەی ئێرانەو حیزبی شیوعی عێراقی ماڵی ئێمەی وەك مەکۆ بۆ تەرخانکردوە ئەڵبەنە باوکم بەوەی زانیوە بەڵام (علی تورکەی لای ئێمەو خوسرەو روزبەی)ی سکرتیری حیزبی تودەی ئێران بۆ گومان لێکردن وای بە چاك زانیوە کرێکاری خۆی بکات دوای دوومانگ لە پشکنینی کتاوخانەکەی باوکم علی تورکە یا باشتر بڵێم (خەسرەو روزبە) گەڕایەوە بۆ ئێران و دەستگیر کراو ئیعدامیان کرد.

کەلاری ئەو دەمە دەتوانم بڵێم جۆرێك بوو لە پێکەوە ژیان ئەگەر بڵێم جیاوازی چینایەتی نەبوبێت هەبووە بەڵام کاتێك درمێك نەخۆشیەك بڵاو دەبوەوە ئیتر ئەمە گرانە تایە، مەلاریایە ،سێوەڕویە، کۆکە ڕەشەیە هەموان تووشی دەهاتین شەوان ئێمەی مناڵانی دێ لە دوسێ گەڕکدا یاری شەوانمان دەکرد و چاوەشارکیە و قەرە هاتمان دەکرد لە بەهاراندا سێ بازوو گورز و بن میخان و هەلوکانمان دەکرد تازەیاری تۆپی پێداهاتبوو ئێمەی مناڵا ڕەمەکی ئەو یاریەمان دەکرد بیگرەو بەردەکی وا توند و تیژمان بە دوای تۆپێکی لاستیکیدا دەکرد دەتوت هێرشی مەغلوین لە قوتابخانەکەماندا هەرمامۆستایەك گەمژەو و تەمەڵا و نەزان بایە وانەی وەرزشیان بۆ تەرخان دەکرد قوتابخانەکەمان شەش پۆلی بۆ پۆلەکان دەرگای پێوە نەبو دوو پەنجەرەی بێ جامی تێدابوو سەرما و باڵا تۆز بەبێ پرس خۆی پیا دەکرد و لەولاوە دەڕۆیشتە دەرەوە.. ئەو دەم کەلار خەستەخانەی تیادا بو برین پێچێك دەیبرد بەڕێگەوە لە قەتابخانەدا هەموو ڕۆژێك ناوی بیماران و نەخۆشەکانیان دەنووسی

بۆ خستەخانە دەڕۆشتن زۆربەمان لە ڕوی سەهەنەیەوە دەڕۆیشتین بۆ تیمارکردن لە لیستی سزادەراندا هەمیشە ناوی منی تیابوو با مونسیف بە سزاکانم هەمیشە لەسەر هەق بو تاخوا حەز نەکا چەتون و لاساربوم.

یاریمان گوزرایەوە لێواری دێ و دو راستە دارمان لە زەویدا چەقاندو وەك دەروازەی گۆڵا کۆمپانیایی (ولیم پریس ) ی بەریتانی بە کێشانی جادەی نێوان گولاڵە و دەربەندیخانەوە خەریك بو ڕۆژێك کریدەیەکی جادە ساف کردن ڕێگەی گوم کرد و خۆی کرد بە کەلاردا نیشتینە ملی و گۆرەپانی یاریەکەمان پێ تاشی و بوێنە خاوەنی ساحەیەکی سنوردار لە دوایدا تەماحگیری دەروازەیەکی ئاسنین بوین بەهەر فەلاکەتێك بۆ شەش لولەی ئسکلەی لە باغیمان بە چنگ هێناو کردمانە دەروازە.. بەوەوە رانەوەستاین ناردمان دەدەست جل و بەرگی یەك ڕەنگمان لە کفری: دوراند بەو شێوە ڕەنگ و ڕووی تیمان لێ نیشت و کەوتینە کەڵەی ناوی تیپەکەمانەوە گەورەکانیش لە ناویاندا بەشداریان کرد و سەرئەنجام ناوی:شیروانە:دەست نیشانکرا..

تا دەبوو باوەڕمان بە خۆ زۆرتر دەبو کەوتینە بیری کێبیرکێوە بریارمان دا لەگەڵا کفریدا ئەنجامی دەدەین. باڕاستگۆبم خۆمانمان زۆر بە گرنگ و لێزان هاتبوە بەرچاو یاری کەرانی کفری هاتن سێ گۆڵی خاوێنی بێ بەرامبەریان لێکردین ئیتر تەماشاکە.. کۆمەڵگایەکی خێڵەکی کوڕەکانی لە ماڵی خوێدا کوێلە و کۆیلە رەفتارێك هەتکیان کا.. ئەوە نەدە زانرا ئەوە فوتبوڵە هونەرە لێزانینە.. دەی ئێمە ئەندامانی تیپی شێروانە لە ڕۆژگارێکدا بوین سەگ نەیبووە... لە هەرکوێیەکدا دەرکەوتینا ئەها کەوتینە چیبکەین چەبکەینەوە.

ئەو دەم دکتۆر حسن ئیستا قوتابی بو لە ناوەندی خانەقیندا بڕیارماندا فێڵا بەکار بێنین هاتین وامان بە چاك زانی پێنچ یاریزانی بە ناوبانگی شاری خانەقین بهێنین تێکەڵی تیپەکەمانی بکەین بڕوینەوە مەیدانی یاریزانانی کفریوە هەروامان کرد، ناوی دوو یاریزانیم لە بیرە یەکێکیان دۆستی ئازیزم مامۆستا: کەمال شاعیر: سکرتێری ئێستای حزبی شیوعی کوردستان ئەوی تریان کاك: علی حەربی: ئەم دوانە بەسەر تەلی یاریزانی نەك تەنها خانەقین بەڵکو لیوای : دەژمێردران.

کاکە ئەوا دوپاسی تەختەمان بەکرێ گرتەوە دەور ناوو هەردولا کەی و سەربانیان پڕی پڕی خەڵك بون کفری بمگرەوهاتم.

گۆڕەپانی کفری جمەی دەهات سەرەتا نەیەشێنم شەش گۆڵی پاك و خاوێنمان لێکردن.. بەوەوە رانەوەستاین هەڵمان کوتایە ناوبازاڕ ئەوەی چاپخانەو کەباب خانەی ناو کفری هەیە ووێنە: کمال

ئەتاتورك:ی تیادا هەڵواسرابوو دامانگرت لەژێر پادا وردوهانمانكرد و ئیتر بە بژی و بە بروخێ لە شارهاتینە دەرەوە,

مامۆستا: كمال شاكر: لە زۆر جێگە و بونیدا باسی ئەو ڕۆژەی دەكات و دەڵێت ئەو ڕۆژە بۆ من وەك ئەلف و بای كوردایەتی بو داستان گەورە كراوە لای دەوڵەت و دەسەڵات و گەیشتە ئەمنی بەغدا و سین و جیم.

ئەم داستانە دەگەڕێتەوە بۆ پەنجاو ئەوەندە ساڵا لەمەوبەر، ئیستاش لە دەرەوە چاو لە دورم وە لە دورەوە یاریەكانی شیروانە چاودێری دەكەم كە دەیبەینەوە دەڵێم ئافەرین كە دەدورینن دەڵێم ئۆف و ئەو ئوفەش دەخەمە سەر هەزاران ئوفی خووم نەتەوە خیر نەدیوەكەم. بە ئومێدی وڵاتێكی ئازاد و میلەتێكی بەختیار دبلێ .... ئامین!...

**٢٠١٨/١/٢٤ هەولێر**

# چەن مەڵویەک لە خەرمانی بیرەوەرییەکانم



• هیدایەت ئەحمەد کەریم

لەهاوینی ساڵی١٩٦٢. ماڵمان لە بنکوورەوە هات بۆ گوندی (بنگرد یان مەکینەکە) کە ئیستا سەنتەری شاری کەلارە، لەبەرنەبوونی قوتابخانە لە بنگرد . من و کاك حەمە غریب ڕوومان کردە قوتابخانەی(گوندی کەلار) و دەستمان بە خوێندن کردووە ئەوکاتە بەندە پۆلی سێی سەرەتایی بووم، سەرەتا هەستم بەنامۆیی دەکرد چونکە لەکەلار کچان شان بە شانی کوڕان دەیانخوێند ، ئەویش دەگەڕایەوە بۆ بەرزی ئاستی کۆمەلایەتی خەڵکەکە . کەلار لە پۆشینی جلوبەرگیشدا لە گوندەکانی تر جیاوازتر بوون، هۆی ئەم دیاردەش کاریگەریی بەگزادەکانی جاف بوو لە سەریان. کە ساڵا بەرەو (١٩٦٤، ١٩٦٥) هەنگاوی دەنا قاتو قری، برسێتی بێ بارانی، نەهاتی، پەتایی قڵاچۆکردنی ئاژەڵا گورزی بێڕحمانەی خۆی وەشاند، سەرباری نەهامەتیەکان ڕژێمەکەی(عبدالسلام عارف) ئابڵۆقەی ئابووی توندی بەسەر ناوچەکەدا سەپاند زۆربەی خەڵك نانی جۆیان دەخوار کەم ماڵا هەبوو نانی گەنم و جۆ یان گەنمیان بخواردایە. یەکێ لە بیرەوەرییەکانم کە قەت لە بیرم ناچێتەوە ڕۆژێکیان دوای تەواو بوونی دەوامی قوتابخانە و ماندووبوونی ڕێگای نێوان کەلار و بنگرد کە گەیشتمە ماڵەوە دایکی ڕەحمەتیمم بینا زۆر مات و مەلول دانشتبوو ئەژنۆکانی گرتبووە باوەشی کە لێم پرسی ووتی: چێشتەنگا سەربازە دڕندەکانی (تەها شەکەرچی) ڕژانە ناوبنگرد و ماڵا بە ماڵیان پشکنی لە ماڵی خۆمان هەرچی گەڕان بە

دوای تاپڕەکەمان باشبوو نەیاندۆزییەوە بەڵام دەستیان لە خەنجەرە دەبانەکەمان بەندبوو، ئەو خەنجەرە یادگاری گەنجێتی باوکت بوو بۆیە بەهەرحاڵێ بێت لەدەستی سەربازەکەم سەند و فڕێم دایە ماڵی دراوسێکەمانەوە، دواتر سەربازەکان هەرچی ئازووقەمان هەبوو ( ئارد ـ خوێ - شەکر - برنج ـ چایی ـ ماش ـ نیسك ) لەناو ڕاستی حەوشەدا تێکەڵا بەیەك كرد بوو. کە باوکم ئێوارە گەڕایەوە ورەی بەرزبوو دەیگوت: خوا رازیقە گرنگ ئەوەیە خەنجەرەکە نەبراوە. خەڵکەکە جوامێرانە ساڵانی نەهاتییان بەرێکردو مەردانەبژێوی خۆیان دابینکرد.

کەناوڕاستی شەستەکانمان تێپەڕاند وردە وردە بزە کەوتە سەر لێوی خەڵك، دواتر کە باڵی مەکتەبی سیاسی لە کەلار بارەگا و بنکەی کردەوە خەڵك هەستیان بە ئازادی دەکرد و ترسی حکومەت نەما لەناخی تاکی کوردا. لەبیرمەلەشارەکانی جەلەولا و خانەقین بە ئاشکرا جولانەوەی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی هەبوو، لە کەلار ئاهەنگێکی نەورۆز کرا بەرامبەر ماڵی حەمە سەعید لەوئاهەنگەدا شێخ لە تیف برایی مامۆستا دارا  کاوەی ئاسنگەر بوو حەمەی میناش ناسراو بە حەمەی ئەحە فەڕاش کرابو بە زوحاك  جارێکی تریش ئاهەنگێکی نەورۆز لە تەنیشت قوتابخانەی کەلار، شۆڕە سواری بەڕێوبردنی ئاهەنگەکە خوالێخۆشبوو ئەحمەد کەلاری بوو بە پەخشان و شیعرە هەست بزوێنەرەکانی زیاتر جۆش و خرۆشی دەخستە ناخی ئامادەبوانەوە، بەندە و ژمارەیەکیتر لە قوتابیان تیپی هەڵپەڕکێ بووین بەپێ ی ئاوازی گۆرانی نەشمیل کچە کورد هەڵپەڕینەکەمان ئەنجامدەدا ئەوانەی لە تیپەکەدابوون و لەبیرم مابێ (عبدللە حسن قادر، شێرکۆ محمد ڕۆستم، عدنان رشید، حسن علی بەگ، هیدایەت ئەحمەد) وینەکانی ئەوکاتە تائێستا پارێزراوە . بیرەوەرییەکی پۆلی شەشەم و مامۆستا حسێن دەگێڕمەوە و دڵنیام مامۆستای گەورەم کەبیخوێنێتەوە زیز نابیت  مامۆستا حسێنی بەڕێوەبەر و پەروەردەکارمان لە ناوراستی گۆڕەپانی قوتابخانە بەرامبەر پۆلی شەش وەستاو ووتی: فڵانە سرود بڵێنەوە بەکۆمەڵا ، ئێمەی قوتابیان زۆر بە حەماسەتەوە دەمانوتەوە و بۆ نەگبەتی خۆم و هاوڕێیانم بە ئەنقەس وشەیەکی نامۆم ئەخانیە نێو دێڕێکی سروودەکە، مامۆستا حسێن ی وریا و زیرەك کەزانی یەکسەر وتی: بوەستن ئەوەکێ بو ئەو وشەنامۆیەی خستە ناو سرودەکەوە کەس وڵامی نەدایەوە هەموشیان زانیان منم و کەسیان ئیعترافیان لەسەر نەکردم، مامۆستا وتی: سزاتان دەدەم باش وایە راستیەکە بڵێن بەهەر حاڵا مامۆستا یەکە یەکە پرسیاری لێ دەکردن و هەرکەس سزای خۆی وەردەگرت، بەبێ ی ڕیزبوونمان من دوا کەس بوم لێپرسینەوەم لێ بکرێ نۆبە گەشتە عەدنانی حەمەی مینا کە لەشانم وەستابوو. مامۆستا حسێن ووتی: عەدنان ڕاست بڵیِ کێ بوو، عەدنان وەستایانە بۆی چوو پێش ئەوەی سزابدرێت هەردوولەپی بردە نزیك دەمی و لەپەسا فوی تێدەکرد  و سەری وەرچەخان بۆلای من، بەکوردییە یانی هیدایەت بوو، منیش خۆم حازر کرد بۆ هەموو ئەگەرێك دەڵێن خودا دەلیلی داماوە بۆیە فریشتەیەکی کردە فریادرەسم ئەوەش شێخ برایم بچکۆل بوو کە گەیشتە گۆڕەپانی قوتابخانەکە سەیری مامۆستا

حسێن ی کرد و حەرەکەیەکی کرد ئیتر مامۆستا ئەمەندە پێکەنی منی لە بیرچوو یەکسەر وتی: قوتابیان بۆ پۆل، هاوڕێکانم قسەیەکی تاڵیان، پێ نەکردم تەنها داخی ئەوەیان لێ دەهات ئەوانی بێتاوان سزادران و منی تاوان بار وەکو بەرزەکیبانان دەرچووم، بەڵام لەو کاتەوە هەتا ئێستا هەرکاتێ باسی شێخ برایم بکرێت دەڵێم هەزار ڕەحمەت لە گۆڕت فریشتەکەم . بیرەوەریەکی تر دەگێڕمەوە بۆ ئەوەی جێژی زیاتر بدەمە نووسینەکەم، ئەویش ئێمەی قوتابیان هەوڵمان دەدا ئەرکی قورسی سەرشانی باوکمان کەمتر بکەینەوە. بیرمە من و عبدللەی هاوڕێم کە ئێستا جێگری پارێزگاری گەرمیانە شان بە شانی باوکمان ئیش و کاری دالێ و مەرەزەمان دەکرد، مامە شێخ ئەنوەر باوکی عبدللە لەکاتی ئیشکردندا هەرکە ماندووببوایە دادەنیشت و مەقامێکی دەوەت ئاگادار بوم گلەی جاریش فرمێسك بە چاوەکانیدا دەهاتە خوارەوە لە من و عبدڵای پرسی ئایا دەزانن شیعری کێ بو لە مقامەکەدا! ئاخێکی هەڵا دەکێشاو ووتی: شیعری شێخ باباعلی (١٨٩٤ـ١٩٤٩ز) برامە و نازناوەکەشی (بێدارە) مام شێخ ئەنوەر چیرۆکێکی خۆشەویستی (بێدار)ی گێڕایەوە منیش دەمەوێت وەکو خۆی باسی بکەم. ووتی : لە کۆتایی ساڵانی بیستەکاندا(بێدار)ی برام لە دەشتی بنکورەوە بە سواری ماینەکەی لە سیروان دەپەڕێتەوە بۆ هەردەکانی جاف بەمەبەستی خوازبێنی کچە ئامۆزایەکی کەلە ڕەش دەواردا دەژیان و خەریکی ئاژەڵداری بوون. ئەڵێت: کاتی(بێدار)گەیشتۆتە نێوان سیدخەلیل و گۆبان مەلە زیقاوڵەیەك بە ئاسمانەوە دێت و دەچێت و هەردەزیقێنێت (بێدار) لە دڵی خۆیدا وتویەتی ئەم مەلە زیقاولە دەڵێ ی هەواڵێکی پێیە، بە ڕێکەوت توشی ڕێبوارێك دەبێت ولێ ی دەپرسێت نازانی هەواری فڵان خێزان لە کوێیە؟ نیازمە بچمە خوازبێنی کچەکەیان، ڕێبوار دەڵێت کاکی برا خۆت ماندوومەکە چونکە کچەکەیان بە شووداوە و هەواریشیان پێچاوەتەوە و چونە بەرە و ژوور، دەڵێت: بێدار بەم هەواڵە دڵتەزێنە یەکسەر دەگەڕێنەوە ئەم شیعرانە دەڵێتەوە.

فەلەك زەبوونم فەلەك زەبوونم
بەی دیتن لەیل خەیلی زەبوونم
شەیداو پەشێو حال وێنەی مەجنوونم
موحەبیەر نەدەور چەرخی گەردوونم
عەزەمم کرد وەلای شایی نەونەمان
ڕوم کرد نە بارگەی گوزەرگای خێڵان
بەکی جە تەیران بەروی حەواوە
خێزاو ستێزا ئاما جە لاوە
بەئاواز مەوات دەروون پڕ جەخار
مەگێڵو سەحرا پەی دیدار یار

جەفات بێ سەفان خاکت بۆ وەسەر
یەخیڵی وەختەن عێل کردن گوزەر
بەوێنەی مەجنوون لەیل گوم کردە بۆ
هەر لەیل لەیلمەن جەپای کەژو کۆ

دواقسەی مامە شێخ ئەنوەر ئەمە بوو: گوێبگرن تەلەبەکان بزانن (بێدار) چی وتوە بۆ نیشتمانەکەی:

ناڵەیەکی زۆر بەسۆز دێ والە جەرگم کاردەکا
تێگەیشتم پڕبەدەم خاکی وەتەن هاوار دەکا
داد و هاواری لە ئێشی صعنەتیبێگانەیە
دەردەدارە بۆیە ناڵەی عالەمێ بێزاردەکا
لە کۆتایدا بە هیوام خوێنەرانی نووسینەکەم لە کەم و کورییەکانم چاو پۆشی بکەن.

**هیدایەت ئەحمەد کەریم: سەر پەرشتیاری پەروەردەی خانەنشیت**

- (ناوم هیدایەت ئەحمەد کەریم)ە
- ساڵی ١٩٥٤ لە گوندی (خدربدر) ی ناوچەی بنکوورە لەدایك بووم.
- تەواو کردنی خوێندنم : سەرەتایی و ناوەندی لەکەلار ئامادەیی لە شارۆچکەی جەلەولا پەیمانگای مامۆستایانم لە ساڵی ١٩٧٩ لە بەعقوبە تەواوکردوە.
- لە گۆڤارەکانی بەیان، ڕۆشنبیری نوێ، نوسینم بڵاوکردۆتەوە
- لە ڕۆژنامەی کەرکوکی ئەمڕۆ ژمارەیەکی بەرچاونووسینم هەیە
- بەشێك لە دیوانی(بێدارم) لەگەڵا ئیبراهیم باجەڵان بە چاپ گەیاندووە.
- لەساڵی(١٩٧٨) ەوە ناوبە ناو شیعرم نوسیوە و تائێستا پاراستوومن.

# هۆکارەکانی دروست بون و فراوانبونی شاری کەلار(تێڕوانینێکی ئابوریيانە)



• مشیرعارف علی

لەرابوردوداوبەپێ ی هەمووسەلمێنراوەجوگرافی و زانستییەکانی گەشەی دانیشتوان،ئەوەرون بۆتەوە کەهیچ ئاوەدانی و کۆبونەوەی نیشتەنیەك،بەبێ هەبونی هۆکاری ئابوری و ژیاری نەهاتونەتەبون.واتەگوندێك،شارۆچکەیەکوشارێك،کەدروست بون،وەك دەڵێن(ئاووئاوەدانی)،بەهۆکاری هەبونی سەرچاوەیەکی ئاو یاخود روباروبونی سروشتی جوان و..هتد پەیدابوە.شاری کەلاریش بەهەمان ئەوهۆکاروپاڵنەرانەی کەرەنگەهەرئاوەدانی و شارێکی پێ هاتبێتەبون،دروست بوە. کاتێکیش لەروی ئابوریەوە باسی لێوەدەکەین ،بەلای منەوەگرنگە بکرێت بەدوقۆناغەوە: قۆناغی یەکەم-قۆناغی دروست بونی کەلارە لەوپانتاییە جوگرافیەدیاریکراوەیدا،قۆناغی دوەم-قۆناغی فراوانبونیەتی بۆئەم پانتاییەی کەئێستاهەیەتی،بەوماوەکورتەوبەبەراوردبەشارەکانی تر.بێگومان بەتێڕوانینێکی ئابوریانە.

قۆناغی یەکەم:قۆناغی دروست بونی کەلار-وەك زانراوە بناغەی دروست بونی شاری کەلار،دەگەرێتەوەبۆگوندی کەلاری کۆن (گەرەکی کەلاری کۆنی ئیستا).دیارە پێش دروست بونی ئەوگوندەش،بنەماڵەی حاجی ئەلماس لەسەر(خڕی حاجی)کەبەتەنیشت کەلاری کۆنداتێدەپەڕی نیشتەجێ بون.کەبێگومان ناوی(خڕی حاجی) بەناوی ئەوانەوەهاتوە. بەبونی ئەو(خڕە)ی کەباراناوی بەرزاییەکانی باکوری ناوچەکەی بەقولایی(٢٠)کم پێدادەهاتەخوارەوەوبەتەنیشت ئەم گەرەکی کەلاری

کۆنی ئێستادا دەرۆیشت و بونی پانتاییەکی فراوانی زەوی کشتوکاڵی و لەوەڕگایەکی باشیش بۆئاژەڵداری ،هۆکاری لەپێشینەی نیشتەجێبونی ئەم خێزانەبوە لەودەوروبەرەدا.بەڵام بیرمان نەچێت،کەلار خاوەنی دەشتێکی فراوانی کشتوکاڵی بوەونزیکیش بوە لەچەمی سیروانەوە،بۆیەکەلکی لێوەرگیراوەبۆ راووشکار،بەتایبەتی ئاسك وکەروێشك.ئەی نەتانبیستوەکە دەڵێن(ئەڵێ ی ئاسکەکەی دەشتی کەلاریت).بەدوای ئەمانیشداخێزانی زیاترلەوێ کۆبونەتەوەولەژێرکاریگەری هەمان ئەوهۆکارانەداولەڕۆژهەڵاتی ئەم خڕەدا نیشتەجێ بون وگوندی (کەلار)یان دروست کردوە.بۆیەئەگەردیقەت بدەین،دواتروکاتێك بەگزادەکانی جاف هاتون و لەکەلارنیشتەجێ بون،لەبەرهەمان ئەوهۆکارانەی سەرەوە ئەم جێگەیان هەڵبژاردوە،بەڵام بەتێڕوانینێکی وردتروئابوریانەتر.ئەمان(بەگزادەکان)زانیویانەکەئەوپانتاییەبەرفراوانەی زەوی،دەکرێت بۆئەوان ئاسانتربێت بۆکشتوکاڵ وباخداری.بەتایبەتی ئەمان کەخاوەنی توانایەکی باشی دارایی و ئیداری بون،بۆیەکارکردن لەسەرجێبەجێکردنی بیرۆکەوئامانجەکانیان بۆبەگزادەکان ئاسانتربوە.وەك پێشترئاماژەم پێکرد،باراناوی گوندەکانی باکوری کەلاری کۆن،بەخڕی حاجی دا تێدەپەڕی بۆیە بەبۆچونی من،ئەوپێدراوەجوگرافیەی سەرەوە ،ڕەنگەبوبێتەمایەی گەڵاڵەبونی بیرۆکەیەکی وردتروزانستیانەتر لای بەگزادەکانی جاف.وەك دەوترێت هەرلەکۆنەوە سودلەسەرچاوەی ئاوی سەیدخلیل وەرگیراوە،بۆیەئەمانیش هاتن ئەوسەرچاوەیان کردەئامانج،کەدەکەوێتە(١٥)کیلۆمەتری باکوری کەلاروبەجۆگەیەك ئاوی سەیدخەلیلیان گەیاندۆتەگوندی کەلاری کۆن وهاوکات بیرێکی ئیرتیوازییان بۆگوندەکەهەڵکەندوە.کەپێکەوەبونەتەمایەی ئاوەدانیەکی زیاتربۆکەلار.جگەلەوەش ئاژەڵدارەکانی کەلار، دەشتی کەلاریان وەك لەوەڕگایەك بەکارهێناوەو لەئاوی ئەم جۆگەیەش مەڕوماڵاتیان ئاوداوە.هەروەها لەگوندی کەلاردا،بەگزادەکانی جاف ،چەندین باخی میوەیان بەئاوی ئەوجۆگەیە رواندوە لە(پرتەقاڵ،لیمۆ،نارنج،هەنار)تەنانەت دارخورماشیان رواندوە،کەتائێستاش چەند دارخورمایەکیان ماون.دیارەپاش دروست بونی گوندی کەلاری کۆن،بەتەنیشت گردەکەی شیروانەوەولە(٣)کیلۆمەتری ڕۆژهەڵاتی ئەم گوندەوەوبەهۆی نزیکی لەچەمی سیروانەوە،چەندخێزانێك نیشتەجێ بون،کەبە(بنگرد)ناودەبرا.جگەلەهەبونی چەندخێزانێکی ترلەگوندی(عەلەومحە)دیسان لەلای رۆژهەڵاتیەوە.بەوشێوەیەوکاتێکیش لەپەنجاکانی سەدەی رابوردودا، ڕێگای وشکانی(سلێمانی-دەربەندیخان-جلولا)قیرتاوکراوبەتەنیشت ئەوانداتێدەپەڕی،ئیترئەم بەروئەوبەری ئەوشەقامە ئاوەدانی زیاتری تێکەوتو،ئەوچەندماڵەی بنگرد،بون بە(دەیان)وفرۆشگایەکیشیان بوبە(دەیان).لێرەوەقۆناغی دووەمی دروست بونی ئەم شارەدەستی پێکرد..

**قۆناغی دوەم:قۆناغی فراوانبون-**

بەشی یەکەم-لەساڵی (١٩٧٠)بەدواوە کەفەرمانی بەقەزابونی کەلاری تێدادەرکراوە دەست پێدەکات،ئیترلەم بەروارەبەدواوەوبەهۆی زیادبونی پێداویستیەکارگێڕی ومرۆییەکانەوەو بەدابەشکردنی سەدان پارچەزەوی (بەئاسانکاریەوە) بەسەرچین وتوێژەجیاوازەکاندا لەسەنتەری قەزاکەدا لەنزیك روباری سیروان،سەرەتایەکی نوێ دەستی پێکرد ،بێگومان لیرەوە،هەموچاوەکان رولەوێ بون بۆکاروکاسبی و بوەهۆی راکێشانی بەشێك لەخێزانەکانی گوندی(کەلاری کۆن)وگوندەکانی دەوروبەر،ئیترلەوکاتەوە،ئەوبنگردە چەندماڵیە بوبەجێگای کاروکاسبی وبازرگانی وبەتەنیشت کەلاری کۆنەوە،شارۆچکەیەك هاتەبون،بەشێوەیەك ڕێژەی زیادبونی دانیشتوانەکەی لە١٩٧٠-١٩٧٧(٣٢%)بوە.

بەشی دوەم:بەشی دوەمی فراونبونی کەلار،لەناوەراستی حەفتاکانەوەدەست پێدەکات ،کاتێك پرۆسەی کاول کردن وخاپورکردنی گوندەکانی کوردستان جێ بەبەجێکراو،سەرجەم گوندەکانی کوردستان وچەندین شارۆچکەش روخێنران وخێزانەکانیان بۆشارەکان گوێزرانەوەولەچەندین ئوردوگاداولەناوچەجیاجیاکانی کوردستاندانیشتەجێ کران،هەرچەندەئەم پرۆسەیە پرۆسەیەکی تەواوسیاسی بوو،بەڵام دواجارلەبەرئەوەی کەلار بوبەناوەندی کۆکردنەوەولەخۆگرتنی ژمارەیەکی زۆری خیزانەکانی ناوچەی گەرمیان ورۆژهەڵاتی روباری سیروان، لەوڕۆژەوە(کەلار)وەك چەقی کاتژمێری لێهات وبەهۆی هەڵکەوتەی جوگرافیەوە کە شارەکانی(دەربەندیخان،کفری،خانەقی) بەدەورەوەبون،بوبەسەنتەرێك بۆبازرگانی وبەدەست هێنانی هەلی کارکردن وکۆبونەوەونیشتەجێ بونی زیاتری خەڵکی ناوچەجیاوازەکان،لەێستادا دانیشتوانی کەلار،بەوەناسراون زیاترلەهەرخەڵکانێکی تر پەی بە(کاری نوێ،بیرۆکەی بازرگانی نوێ،چالاکی ئابوری نوێ)دەبەن، لەبەرپێویستی شارەکەش بەبنیاتنان وئاوەدانی ،هەرلەکۆتایی حەفتاکانەوە کارگەی بلۆکی دەستییان هێناوەتەکەلاروبەدوای ئەویشدا زیاترلە(٨٠) کارگەی بلۆکی ئۆتۆماتیکییان هێناوەتەکەلار،کەتاکوئێستا کارگەئۆتۆماتیکیەکانی بەردەوامن لەکارکردن وبونەتەسەرچاوەی ژیان بۆسەدان کرێکاروخێزانی شارەکە،هاوکات بەهۆی بونی مەوادێکی زۆری چەوولمەوەلە روباری سیرواندا،نزیکەی (٣٠) کارگەی شۆردنەوەی لم وچەوی لێ دامەزراوە،بۆیەئەگەربەهەڵەدانەچوبم،لەئێستاداکەلار،لەسەرئاستی کوردستان وعێراقیش،خاوەنی زۆرترین کارگەی(بلۆك،شۆردنەوەی لم وچەو)ە،جگەلەوانەش کەلار لەئێستادا،دەیان کارگەی(پلاستیك،ئاوی خواردنەوە،ماست و..هتد)، هەروەها کاسبکاروبازرگانەکانی بەوە جیادەکرێنەوەکە،کارێکیان پێباشە (قازانجەکەی)لەکەمترین کاتدا بکاتەگیرفانەکانیان،هەرچی پەیوەستەبەئاژەڵداریەوە،ئەوا قەزای کەلار تاساڵی ٢٠١٢ نزیکەی(٢٨٣٠٠٠)سەر مەڕ،بزن ومانگای تێدابوە،لەم ساڵانەی دواییداوپاش ئەوەی بوبەناوەندی ئیدارەی گەرمیان وبەهۆی نزیکی لەدەروازەی نێودوڵەتی پەروێزخانەوە،ئەم شارە- :

١.بوەبەکۆگای کەل وپەل وشت ومەکی هاوردەکراوی ئێرانی،تورکی،چینی وکۆری وهەناردەکرنەوەی بۆشارەکانی تری کوردستان وعێراق.

٢. چەندین بریکاری کۆمپانیابەرهەمهێنەبەناوبانگەکانی جیهان لەم شارەدابونیان هەیە.

٣. کەڵك وەردەگیرێت لە سەدان بیری ئیرتیوازی وخانوی پلاستیکی وپرۆژەی جۆراوجۆری تری کشتوکاڵی وئاژەڵداری.

لەهەموئەوانەگرنگتر،لەم ساڵانەی دواییدا،چەندین کێڵگەی نەوت وگازی تێدا دۆزراوەتەوەوبەرهەمی بەرچاویشیان هەیە.

هەربۆیەبەشێوەیەکی سەرنج ڕاکێش ئەم شارەگەشەی کردوەو فراوان بوە.لەکۆتاییدا ،ڕاستەهۆکارەسیاسیەکان ڕۆڵیان هەبوەلەکۆبونەوەوکۆکردنەوەی خەڵکێکی زۆرلەم شارەدا،بەڵام بەبۆچونی زۆرسادەی بەندە ،هەرلەسەرەتاوەهۆکاروپاڵنەرەئابوریەکان لەپێشەوەی ئەوهۆکارانەبون کە ئەم شارەی لەم دەشتەکاکی بەکاکیەدادروست کردوەو، کەلاریشی لەگوندێکەوە کردوە بەوشارەی کەژمارەی گەرەکەکانی بگەنە(٢٨)گەرەك وژمارەی دانیشتوانەکەشی لە(١٠٨٦)کەسەوەلەساڵی(١٩٥٧)،بگاتە نزیکەی(٢٠٠٠٠)کەس لەئێستاداو،(خانوبەرەشی)گرانترین بێت لەسەرئاستی کوردستان وعێراق،وەك هەندێك سەرچاوەی نافەرمیش دەڵێن(لەسەرئاستی جیهان).لەئێستاشدا کەلار بوەتەناوەندێکی گەورەی کاروبازرگانی بۆ گەرمیان وناوچەکە ..

**تێبینی/بۆهەندێك لەزانیاریەکان،سودم وەرگرتوەلە-:**

١ . کتێبی (کەلار-مێژویەکی دێرین وجوگرافیای شارێکی زیندو)ی (رزگارحاجی حمید).
٢. (مامۆستا احمدباوەر

# شێروانەو تیلەکۆ
# مێژووی کارگێڕییان سڕایەوە



• ڕزگار حاجی حەمید

دوای ئەوەی به پێی مەرسومێکی کۆماری ( ٣٠ ) ژمارە ( ١٣٧ ) بە پێکهێنانی قەزای کەلار لە (١٩٧٠/٢/٢٨) ەدا لەپارێزگای کەرکوك ، لەلایەن سەرۆك کۆماری عێراقەوە واژۆ کرا، کە هەردوو ناحیەی شێروانەو پێباز دەکەوێتە سنووری ئیداری ئەم قەزاوە ، دواتر بەپێی ئەو سیاسەتەی رژێمی بەعس پەیڕەوی دەکردبۆ گۆڕینی دیمۆگرافی کوردستان بەگشتی وکەرکوك بەتایبەتی، کەم کردنەوەی ڕێژەی کورد لەوناوچانە وهاوردە کردنی عەرەب و نیشتە جێکردنیان ،بە پێی فەرمانی کۆماری ژمارە( ٦٠٨ ) لە ١٩٧٥/١١/٦ نەخشەی کارگێڕی قەزای کەلاری لە پارێزگای کەرکوك هەڵوەشێنرایەوە و خرایە سەر پارێزگای سلێمانی ،هەرچەندە قەزاکانی ( چەمچەماڵ وکفری و خورماتوو ) یشی گرتەوە ،کەواتە تا ناوەڕاستی حەفتاکان کەلار سەر بە پارێزگای کەرکوك بوو ، کە پێکهاتبوو لە هەردوو ناحیەی شێروانە وە پێباز، دواتر بە پێی فەرمانی کۆماری ژمارە ( ٦٠٧ ) لە مێژووی ( ١٩٧٥/١١/٦ ) ناحیەی شێروانە لە قەزای کەلارەوە دەخرێتە سەر قەزای کفری، ئەگەر سەرنج بدەین لە یەك ڕۆژدا ئەو فەرمانانە دەرچوون ، کە ژمارەکانیان یەك لە دوای یەکن ( ٦٠٦، ٦٠٧، ٦٠٨ ) تەنانەت زنجیرەی لاپەڕەکانیش ( ١٧٥ ، ١٧٦ ، ١٧٧ ، ١٧٨) لە ( ١ /١٩٧٥/١٢ ) بە بڕیاری ژمارە ( ٢٦٣٦٣ )کە لە ڕۆژنامەی ڕەسمی ( الوقائع العراقیە ) دا بڵاوکراوەتەوە بە ئیمزای وەزیری ناوخۆ ، ناحیەی شێروانە ناوەکەی گۆڕاوە بۆ ناحیەی سەرقەڵا ، بە ( ٢٤ ) موقاتەعەوە لە قەزای کەلار وەرگیراوەتەوە وخراوەتە سەرقەزای کفری ، بە فەرمانی کۆماری ژ( ٦٠٧ )کە لە ( ٦/ ١١/ ١٩٧٥ ) دەرچووە ، بەم شێوەیە ناحیەی شێروانە پارچە پارچە کراو،ناحیەکانی ( سەرقەڵا وکۆکس و تیلەکۆ ) لەکۆتایی شەستەکاندا گوندی جەبارە ی

لێدابڕاو كرانە ناحیە ، تەنانەت ناوەكەشی وەك یەكەی كارگێڕی نەما ، شێروانە ناحیەیەكی دێرینە لە چەندین سەرچاوەی عەرەبی وكوردی دا ناوی هاتووە بە ناحیەی قەڵای شێروانە ،لێرەدا ئاماژە بە هەندێ سەرچاوە دەكەین ، وەك خۆی وەك ئەوەی لەسەر چاوە عەرەبیەكەدا هاتووە، (سی جی ادموندز ) چەندجارێك ناوی ناحیەی قەڵای شێروانەی هێناوە لە كتێبەكەی دا ،وەك لە خشتەی خوارەوەدا دەبینرێت:

**خشتەی ژمارە (١)**

**لیوای كەركوك بە پێی یەكە كارگێڕییەكانی**

| قـەزا | نــــاحـیـــــە |
| --- | --- |
| مركز اللواو | كركوك ، داقوق ، ئالتون كوبرى ، قره حسن ، شوان ، الملحه . |
| كفرى | گوز ، قرگبه ، قلعه شيروان ، شبيجه . |
| جمجمال | جمجمال ، أغجلر |
| گيل | گيل ، سنكاو |

المصدر : د. خليل اسماعيل محمد ، كركوك دراسات فى التكوين القومى لسكان ،مگبعه صلاح الدين ، أربيل ٢٠٠٨



بەهەمان شێوە لە سەرچاوەی ( دليل المملكه الدليل الرسمى للعراق لسنه ١٩٣٦،موسوعه سنويه،اداريه اجتماعيه اقتصاديه تجاريه زراعيه مصوره،صاحب الأمتياز،الياهود نسكور،رائيس التحرير ،محمود فهمى درويش ،مكتبهالحجارات،بيروت،لبنان ) چەند جارێك ناوی حیەی قەڵای شێروانە هاتووە ، ناحیەی تیلەكۆ بەپێی فەرمانی كۆماری ژمارەی ( ٦٠٦ ) كە لە ١٩٧٥/١١/٦ بە واژۆی سەرۆك كۆمار، بە ( ٦٠) موقاتەعەوە دەبێتە ناحیە لە سەر قەزای كەلار، كەناوەندی ناحیەكە لە تیلەكۆی گەورەبوو پێشتر هەردووتیلەكۆی گەورەو بچووك سەربە ناحیەی شێروانە بوون ،پێكهاتووە لە (١٣٠) گوندو ژمارەی دانیشتوانەكەی پێی ی سەرژمێری ساڵی ١٩٧٧ ٧٤٩٠ دەكاتە كەس و١٦٥٩ خێزان ، لەڕوی پێكهاتەی ڕەگەزییەو ژمارەی نێر دەكاتە (٣٨٧٣) و مێ ژمارەكەی دەكاتە (٣٦١٧) ،ڕوپێوەكەی ٨٣٩كچگ بووە ، ٤٧ خوێندنگەو یەك بنكەی تەندروستی و٤٢ مزگەوتی تیادابووە دواتر ئەوانە هەموو خاپوور كران ، لەگەڵ (٤٥٠) گوندو چەندین ناحیەو قەزای تردا ،جگە لە ئەنفال كردنی زۆرێك لە دانیشتوانی كوردستان بەگشتی و گەرمیان بە تایبەتی ، لە ئێستادا تیلەكۆ ئاوەدانە كارەباو ڕێگای قیرتاوی هەیە شوێنێكی دڵگیرە بەهاران خەڵكێكی زۆر بۆسەیران ڕوودەكەنە تیلەكۆ، زۆربەی خەڵكەكەی لە ناحیەی ڕزگاری و بەشێكی كەمی تری لە كەلارو دەوروبەری نیشتجێن ، لەدوای ڕاپەڕینەوە زۆرێك لەو ناحیانەی كەلەلایەن حكومەتی عێراقەوە لە ڕووی كارگێڕییەوە هەڵوەشێنرایەوە دووبارە یەكە ئیدارریەكانی بۆ دروستكرا ، هاوكات چەندین ناحیەی نوێ لە هەرێم دا پێكهێنران لە قەزاكانی دەربەندیخان و كەلار و كفری ئەم حاڵەتە بوونی هەیە ، بۆیە جێی خۆیەتی

بە هەمان شێوە هەردوو ناحیەی شێروانە و تیلەكۆ دەتوانین بڵێین ناحیەی دایك بوون چەندین ناحیەی تریان لێ درووستكرا ، گوندەكانیان بە سەردا دابەشكرا بەڵام خۆیان ناویشیان وەك یەكەی كارگێڕی نەما لێرەدا پێشنیار دەكەم-:

١-ناحیەی تیلەكۆ كە چەند ساڵێك ناحیە بوو لەگەڵ گوندەكانیدا خاپور كران، زۆرێك لە دانیشتوانەكی ئەنفال كرا لە ئێستادا هەندێكیان گەڕاونەوتەوە و گوندەكانی دەوروبەر ئاوەدانن ، بەڵكو لە ڕووی كارگێڕییەوە ناحیەكەیان بۆ بگەڕێتەوە ٠

٢ -شێروانە كەناحیەیەكی دێرینە ناحیەی دایك بووە ناحیەكانی [ سەرقەڵا ، جەبارە ، كۆكس ] لە گوندەكانی ئەم ناحیە دروستكران خۆشیان گوندێك بوون سەر بەناحیەی شێروانەبوون ،پێشنیار دەكەم وەك قەزاكانی تر ناحیەی مەركەزی بۆ دابنرێت ، كە كەلاریش (٢٣) گوند سەر بە ناوەندی قەزاكەن ناو بنرێت ناحیەی شێروانە،

**سەرچاوەكان:**

١.محەمەد سەعید سۆفی ، پارێزگای كەركوك لەناو پاكتاوی ڕەگەزیدا ، چاپخانەی بەرهەم ، وەزارەتی ڕۆشنبیری ، ساڵی (٢٠٠٣) .
٢-المراسیم الجمهوریه ، ١٩٦٨-١٩٧٧ ، رقم ٦٠٨، ٦٠٧، ٦٠٦
٣-الجمهوریه العراقیه ، وزاره التخگیگ ، الجهازالمرکزی للاحصاْ و ، نتائج التعداد العام للسکان لسنه ١٩٨٧، محافظه السلیمانیه ، ١٩٨٨ .
٤-رزگار حاجی حەمید ، كەلار مێژوویەكی دێرین و جوگرافیای شارێكی زیندوو،چاپی یەكەم،چاپخانەی یاد٢٠١٤



التشكيلات الادارية

رقم ٦٠٨

بسم الله الرحمن الرحيم

**مرسوم جمهوري**

استنادا الى المادة الخامسة من قانون المحافظات رقم ١٥٩ لسنة ١٩٦٩ المعدل وبناء على ماعرضه وزير الداخلية

رسمنا بما هو آت :ـ

١ ـ فك ارتباط قضائي جمجمال وكلار من محافظة كركوك والحاقهما بمحافظة السليمانية .

٢ ـ فك ارتباط قضاء كفري من محافظة كركوك والحاقه بمحافظة ديالى .

على وزير الداخلية تنفيذ هذا المرسوم

كتب ببغداد في اليوم الثاني من شهر ذي القعدة لسنة ١٣٩٥هـ المصادف لليوم السادس من شهر تشرين الثاني لسنة ١٩٧٥م .

احمد حسن البكر
رئيس الجمهورية



التشكيلات الادارية

رقم ٦٠٧

بسم الله الرحمن الرحيم

**مرسوم جمهوري**

استنادا الى أحكام المادة الخامسة من قانون المحافظات رقم ١٥٩ لسنة ١٩٦٩ المعدل وبناء على ماعرضه وزير الداخلية .

رسمنا بما هو آت :ـ

فك ارتباط ناحية سرقلعة (شيروانة) التابعة من المقاطعات التية أرقامها وأسماؤها أدناه من قضاء كلار ، والحاقها بقضاء كفري :ـ

(٢٥) سرقلعة (٢٦) عمر بل (٢٧) ميل قاسم كبير (٢٩) كاني ناران (٣٠) جوار شاخ (٤٤) ولي حيدر (٤٥) قاج عمر (٤٦) سيد حزني (٤٨) ابراهيم خان (٥٢) ميل قاسم صغير (٥٦) دروونه كبير (٥٧) دروونه صغير (٧١) نا صالح (٧٢) يكه جبالاو ويانا (٧٧) كويك و(٧٨) كاكوكي ، (٧٩) عبدالله فت (٨٠) زكي وحاج عواد و(٨١) بكرمثل (٨٢) يلكة و(٨٧) كواير مات (٩٣) [illegible] (٩٤) سيده (١٢٤) شاكل .

على وزير الداخلية تنفيذ هذا المرسوم

كتب ببغداد في اليوم الثاني من شهر ذي القعدة لسنة ١٣٩٥هـ المصادف لليوم السادس من شهر تشرين الثاني لسنة ١٩٧٥م .

احمد حسن البكر
رئيس الجمهورية

التشكيلات الادارية

رقم ٦٠٦

بسم الله الرحمن الرحيم

**مرسوم جمهوري**

استنادا الى أحكام الفقرة الاولى من المادة السادسة من قانون المحافظات رقم ١٥٩ لسنة ١٩٦٩ (المعدل) وبناء على ماعرضه وزير الداخلية •

رسمنا بما هو آت :ـ

استحداث ناحية في قضاء كلار باسم ناحية (بيلاكو) يكون مركزها في قرية (بيلاكو كبير) وتتبعها المقاطعات المبينة أرقامها وأسماؤها أدناه :

(٢٨) روتين • (٣١) توكن (٣٢) سي خران (٣٣) سالة (٣٤) فرج ويس (٣٥) قلاوريلة (٣٦) بيلاكو كبير و(٣٧) سركل و(٣٨) زالان (٣٩) كاكەبرا (٤٠) تيمسي (٤١) عليان كبير (٤٢) كاكه حمه (٤٣) عزيز قادر • (٤٧) قلا حرملة (٤٩) عليان الصغير (٥٠) ياله جار (٥١) قره توجالي (٥٢) ميل قاسم صغير و(٥٤) كافة خسلم و(٥٥) كومه زرد (٥٨) سي كردان (٥٩) به سول (٦٠) كلاجو (٦١) هواره برزه (٦٢) بيلاكو صغير • (٦٣) زرد محمود (٦٤) زرد قادر (٦٥) زرد حمه (٦٦) خلوه (٦٧) ئاوه (٦٨) هواره قوله (٦٩) بلا دناك و(٧٠) توران شيخ سعيد (٧٣) تيوران بابا رسول (٧٤) قبري ملا (٧٦) زرين (٨٣) برسوسي (٨٤) توالي (٨٥) يوسفه (٨٦) شوراو (٨٨) دو خران (٨٩) منصور الكان (٩٠) كاني عيد (٩١) بوه (٩٢) شاه نظر (٩٧) تازه دي ـ تازي (١٠٣) كبروك (١٠٤) كاني جايله (١٠٥) كومه زدرد (١٠٨) توه قسوت (١٠٩) دو ميلان (١١٠) ده نكموه ره (١١١) كرسك وصوفي (١١٢) حاله بك (١٢٠) قوله سوتاو و(١٢٥) به براز سرو وخوارد (١٢٦) خسان وزوق أغا (١٢٧) قولجان سرحد (١٢٨) قولجان أمين قهرمان • (١٢٩) سەرش/ناحية سر قلعة (شيروانه) •

وتكون حدودها الادارية الحدود الخارجية للمقاطعات المرقمة (٨٤) و(٨٣)و(٩٢) و(١٢٦) و(١٢٠) و(١٢٨) و(١٢٧) و(١٢٨) مرة ثانية و(٩٠) و(٣٩) و(٥٥) و(٥٤) و(٣٧) و(١٢٥) و(١١١) و(١١٢) و(١٠٨) و(١٠٤) و(٩٧) و(٨٦) و(٧٣) و(٧٠) و(٥٠) و(٥١) و(٥٨) و(٥٩) و(٣٣) و(٣٢) و(٣١) و(٤٣) و(٤٧) و(٨٣) مرة ثانية •

التشكيلات الادارية

رقم ١٣٧

بسم الله الرحمن الرحيم

**مرسوم جمهوري**

استنادا الى المادة (٥) من قانون المحافظات رقم ١٥٩ لسنة ١٩٦٩ وبناء على مقتضيات المصلحة الادارية •

رسمنا بما هو آت :ـ

احداث قضاء بمحافظة كركوك باسم قضاء (كلار) يكون مركزه قصبة (كلار) وترتبط به ناحيتا (شيروانه) و (بيباز) وتكون حدوده الادرية الخارجية الحدود الادارية للناحيتين المذكورتين •

على وزير الداخلية تنفيذ هذا المرسوم

كتب ببغداد في اليوم الثاني والعشرين من شهر ذي الحجة لسنة ١٣٨٩/

المصادف لليوم الثامن والعشرين من شهر شباط لسنة ١٩٧٠/

احمد حسن البكر

رئيس الجمهورية

# دادگای کەلار...

● گۆران حسێن ئەحمەد

**پێشەکی:**

یاسا دانان دوو واتایی هەیە، واتایەکی تایبەت و واتایەکی گشتی. واتای گشتی بریتیە لە دانانی دادگارییە یاساییەکان و هەڵهێنجانی لەسەرچاوە جیاوازەکانییەوە وەك ئاین و نەریت و دادوەری و فقهی وپرنسیپەکانی دادپەروەری و ئەو دەستەی دەسەڵاتی یاسادانان پیادە دەکات. واتای تایبەتی بریتیە لە دانانی دادگاریە یاساییەکان لەلایەن ئەو دەستەی کە ئەو مافەی هەیە، لەوانە دەسەڵاتی یاسادانان یاخود دەستەیەك کە نوێنەرایەتی هەموو گەل دەکات پیادە دەکرێت...

بێگومان یاسا کۆمەڵە بنەماییەکە هەڵس و کەوتەکانی تاك لە کۆمەڵگادا رێك دەخات، هەموو کۆمەڵگایەك پێویستی بە یاسا و رێساییەك هەیە بۆ رێکخستنی تاك لە رووی هەڵس وکەوتەوە ،دەچێتە ژێر چەند بنەماییەکی جییاوازەوە کە بریتییە لە بنەماکانی یاسایی و ئایینی و ڕەوەشتییەکان و ماف و ئەرك بۆ تاك ڕێکدەخات، یاساناسان ئەمرۆ لە یاساکانی  سەدەکانی ڕابردوو دەکۆڵنەوە دواتر دەست دەکەن بە تاوتوێکردنی پەرەپێدانی یاسا تاکو بگونجێت لەگەڵ ئەو حاڵەتە پێشکەوتووەی ،کە کۆمەڵگا پێیگەیشتووە لە سەر پەرەسەندنییان...

چۆن بنەما و سیستەمە یاساییەکان بە درێژایی مێژوو سەریانهەڵداوەو چۆن پەرەیان سەندووە و کارێگەریان لەگەڵ یەکتردا کردووە و ئەو فاکتەرانە چین کە کاریگەرییان هەبووە لە دادگا، لە هەموو وولاتێکدا وەك بنەما دادگەرییەکانی یاسایی ئەو وولاتە جێبەجێدەکات، بەڵام تێگەیشتنی تەواو لە زانستی یاسا لەکاتی ئێستادا پێویستی بە فراوانکردنە. یاساناسان لە ڕابردووی سیستەمە یاساییەکان و سەرچاوەکانی یاسا دەکۆڵنەوە ودەڕواننە ئایندە بۆ ئەوەی زیاتر گونجاو بێت لەگەڵ ژیانی پێشکەوتنی کۆمەڵگادا. بۆیە زانکۆکانی ئەمریکا لێکۆڵینەوە لە مێژووی یاسا و زانستی یاسا دانان دەکەن،چونکە ئاشنابوونە بە پەیوەندی نێوان زۆرێك لەسیستەم و بنەما یاساییەکان، هەروەها بەم شێوەیە کەسی یاسایی دەتوانێت بە توێژینەوەکەی لە مێژووی یاسا پێگەی ڕاستەقینەی بنەما و سیستەمە یاساییە تازەکان هەست پێی بکات. لەبەرامبەردا مێژووی تایبەتی هەموو یاساییەك مێژووی گشتی یاسا هەیە، مێژووی گشتی یاسا لە مێژووی یاسا دەکۆڵیتەوە، لە کۆنترین سەدەکانی هەموو وولاتانی سەر زەوی. بۆیە لەسەرتاوە پێوستە لەسەرمان توێژینەوە بکەین لە مێژووی گشتی یاسا دواتریش مێژووی تایبەتی هەندێك یاسا بخەینەروو.کاروانی شارستانی مرۆڤایەتی هەرچەندە سادەو سەرتایی بووبێت بەڵام نەگەیشتووەتە نووسین تەنها لە دوای چەند قۆناغێکی دوورو درێژ لەڕۆیشتن بەرەوپێشەوە.

دەبێت تێگەیشتمان هەبێت لەبارەی سەرهەڵدانی بیرۆکەی یاسا و دروستبوونی سیستەمە یاساییەکان، بەشێك لەوباوەڕەدان خانەی یەکەمی کۆمەڵایەتی بریتی بووە لەکۆمەڵێك مرۆڤ کە پەیوەندی خزمایەتی لە نێوانییاندا نەبووە،بەڵکو ئەوەی هانیداوە پێکەو ژیان و ئارەزووی هاوکاریکردن بووە لەسەر دوورخستنەوەی مەترسی و بەدەستهێنانی بژێوی. هەروەك زانایی کۆمەڵناس (ماك لینان) دەڵێ: یەکەم کۆمەڵەی مرۆڤایەتی پێك هاتووە ،لەچەند تاکەکەسێك کەپەیوەندی خزمایەتی لە نێوانیاندا نەبووە،بەڵکو ڕێکەوت یاخود پێویستی ژیان کۆیکردوونەتەوە، بۆ دوورخستنەوەی مەترسییەکان و بەدەستهێنانی بژێوی...

بارودۆخی کۆمەڵگە سەرەتاییەکان دژوار بووبە جۆرێك، مێینەکان زیندەبەچاڵ دەکران و بەمجۆرە ڕێژەی ئافرەتەکان کەمبووەو چەند پیاوێك بەشدارییان لەیەك ئافرەتدا دەکرد،بەمەش سیستەمی دایکایەتی بوو (Matriarcat) کە بریتی لەو خێزانەی پێکدێت لە دایك و منداڵەکان و لەگەڵ ژمارەیەك پیاو، پاشام سیستەمەکە گۆردرا بۆ سیستەمی خێزانی باوکاییەتی (Patriarcat) کە تێیدا ئافرەتەکان تایبەت دەبوون بەچەند براییەك و دواتر تەنها بۆ برا گەورە دەماییەوە. دواتر تیۆری خێڵی تەوتەمی هەبووە، ئەم خێڵە کۆمەڵە کەسێك لەخۆ دەگرێت کەپەیوەندی، روحی کۆیکۆدونەتەوە و بەو باوەڕەی هەموو یان دەگەڕێنەوە سەر یەك تەوتەم. ئەرستۆ لەو باوەڕەدا بوو خێزان بنەرەت و سەرچاوەی دەوڵەتە. لەلایەکی ترەوە ئاماژەم داوە لە چۆنیەتی بەرەو پێش چوونی یاسای و دادورە لەسەر دەمی ڕۆمانییەکان و یۆنانییەکان و پاشایەتی و کۆماری و شاهانشایەتی. لەم باسەدا ئەو کێشەی رووبەرووی من بووە بریتی بوو لە نەبوونی سەرچاوە سەبارەت بە دادگای کلار و زانیارییەکان تەنها لە رێگای تیلفون و چاوپێکەوتنەوە کرا لە گەڵ ئەو کەسانەی کە لەژیاندا مابوون و زۆر بەباشتی زانیارییەکانیان لەبەردەست نەبوو، لە لایەکی ترەوە ئاماژەم کردووە بەسیستەمی دادگا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و سیستەمی دادگای عێراق...

**سیستەمی یاسایی سەرەتایی: کۆمەڵەی مرۆڤایەتی لەسەرتادا ملکەچیی دووسیستەم بووە,**

یەکەم/ بریتی بووە لەسیستەمی باوکایەتی یاخود دەسەڵاتی سەرۆك خێڵ ،لەڕێکخستنی پەیوەندییەکان لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگادا. لەم سیستەمەدا تاکەکانی هەموو خێزانێك بریتی بوون لە ژن و منداڵ و ئەوانەی لە خۆیان گرتووە ،لە خزمەتگوزارو کۆیلەکان ..هەموویان ملکەچی تەواوی سەرۆك خێزان بوون...

دووەم/ سیستەمی فەرمانڕەوایی هێز بووە بۆیە دانیان بەماف و پارێزگاری یاسایی نەدەنا لەچوارچێوەی کۆمەڵگادا تەنها بۆ تاکەکان نەبێت ،ئەوانەی نەناسراو بووایە لەناو خۆیاندا کوشتنی حەڵاڵ بوو، ماڵ و سەروەتەکەی تاڵان دەکرا ،چونکە دەسەڵاتێکی باڵانەبوو تاکو پەیوەندی نێوان

كۆمەڵە جییاوازەكان ڕێك بخات و هێرشكردن ،جێگای شانازی بوو، تۆڵەسەندنەوە ئەكرێك بوو كە نەرم و نیانی تێدا نەبێت. شوێنەواری سیستەمی سەرتایی لەم سیستەمە یاسایانەی خوارەوە دەركەوت (سیستەمی خاوەندارێتی، سیستەمی تاوان و سزا، سیستەمی دادوەری)

**شوێنەوارەكانی سیستەمی سەرتایی بریتی بوو لە:**

(سیستەمی هاوسەرگیری، دابو نەریتی فڕاندن(رەدوو)ی، ئافرەت لە كۆمەڵەكانی تر بووە هۆی جیگیركردنی بیرۆكەی هاوسەرگیری كردن ،لەدەروەی چوارچێوەی كۆمەڵگادا ،تەنانەت هاوسەرگیری حەرام بوو لە نێوان براكان و مامەكان و خاڵەكان و یاخود لەگەڵ منداڵی براكان ومناڵی خوشەكەكان لەسایەی یاسایی كۆندا وەك یاسایی ڕۆمانی.یان سیستەمی ژن بەژن باو بوو لای عەرەبەكان،یاخود سیستەمی فرەژنی، یاخود سیستەمی بائنە لای ڕۆژئاوا گەشەی سەند ،بریتیە لەو سامانەی كە ژن یاخود كەس و كارەكەی پێشكەشی ماڵی هاوسەرێتی دەكەن ،بۆ پیاو هەیە سوودی لێوەربگرێت ،بەڵام خاوەندارێتەكەی بۆ ژنەكە دەمێنێتەوە، بە مردنی دەگوازرێتەوە بۆ مناڵەكانی،یاخود رەچەڵەك و خزمایەتی یان دەسەڵاتی باوكاییەتی یان میرات یان سیستەمی خاوەندارێتی وەك خاوەندارێتی زەوی كشتوكاڵی بە كۆمەڵ. یاخود سیستەمی تاوان و سزا بریتی بوو سێدارە دان ودوورخستنەوە و فەلاقەكردن یان تۆڵەسەندنەوە ئەوە دەخوازێت، هەمان كاری تاوانكاری بەسەر تاونكاردا جێبەجێبكرێت، یان خوێنبایی بریتی بوو لەوەی، هەندێك لەسامانی تاوانكار دەدرا بە تاوان لێكراو . زۆرێك لەنەتەوە كۆنەكان بەكاریان دەهێنا لەوانە عەرەبەكان و هندییەكان و رۆمانییەكان... یاسا لەسەردەمی هاوچەرخدا خاڵی نییە لە هەندێك شوێنەواری ئەم سیستەمە...

**سیستەمی دادوەری:**

پێشكەوتنی شارستانیەتی مرۆڤایەتی دەبێـَتە هۆی زاڵبوونی مرۆڤ بەسەر سروشت. هەركاتێك بگەڕێینەوەبۆ دواوەو بۆ سەدەكانی پێشوو دەبینین مرۆڤ كەمتر تێگەیشتنی هەبووە لەشتەكانی دەورووبەری و كەمتر زاڵ بووە بەسەر دیاردەكانی سروشت و كاریگەرییەكانی. پێیان وابووە هەموو دیاردەیەكی سروشتی روحێك هەیە دەجووڵێنێت و بەرێوەی دەبات. بۆیە لە بیری خۆیدا خوداوەندێكی داناوە بۆ جوانی و دانای و دادوەری و چارەسەركردنی كێشەكان، ئەم وێنایەی كێشاوە لە مێشك و هزریدا جا بۆ كەمكردنەوەی كێشەكان بووبێت یان لە ترساندا. سیستەمی یاسایی عیراقی زیاتر نزیك بووە لە سیستەمی یاسای میصری، هەروەها یاسایی میصری لە یاسای فەرەنسیەوە زیاتر نزیكە لەیاساكانی تر. بەمجۆرە یاسا سەرهەڵدا ئەویش یاسادانان بیاخود یاسایی نووسراوە كە بریتیە لە تۆماركردنی نەریت بۆ خەڵك ئاشكرا كران و بنەما یاساییەكان ئەم شێوازانەیان وەرگرت.

١-فەرمانی خودایی.

٢-نەریت.

٣-یاسایی نوسراو.

بە پێشکەوتنی شارستانیەتی مرۆڤایەتی خەڵك پێیان وابووە دەرچوون لەو بنەماو ڕێکخەرانەی کۆمەڵگا بە تەنها نابێتە هۆی تێکشکاندنی خوداوەند بەڵکو زیان بەبەرزەوەندیەکانی کۆمەڵگا و نمونە باڵاکان دەگەیەنێت، بۆیە کۆمەڵگا تێکەڵ بوو لە جێبەجێکردنی دادگارییەکانی ئەم بنەمایەو سەپاندنی سزایی دونیایی لەسەر ئەوەی سەرپێچی دەکات و تاوان ئەنجام دەدت، نمونەی یاسا کۆنەکان لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دەخەینە ڕوو.

**یاسا کۆنەکانی ڕۆژهەڵات:**

**١-یاسایی عێراقییەکان:**

کۆنترین یاسایی نوسراو کە پێگە پشتوون بریتیە لە یاسا عیراقیە کۆنەکان، بۆیە کۆمەڵگایی عیراقی کۆن بەیەکەم کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دادەنرێت کە لە سایەی یاسادا ژیابێت.



**٢-یاسای ئورنمو:**

ئەم یاساییە سێ سەدە لە پێش یاسایی حمورابیە، تەنها پێشکی و چەند ماددەیەکی بە دیاریکراوی دەرکەوتووە، لە پێشەکی ئەم یاسایەدا ئورنمو بانگەشەی ئەوەی کردووە کە دەسەڵاتەکانی لە خوداوەندەوە پێگەیشتووە و کە بە درێژیی مێژوو مرۆڤ بە دەستیەوە ناڵاندوویەتی.

**٣-یاسای بلالاما پاشای ئەشنونا:**

ئەم یاساییە دەرچووە بە دووسەدە لە پێش یاسایی حمورابی، لە ساڵی (١٩٣٠) پێش زاینی بووە. ئەم یاساییە کەمترین گرنگی بە ئاستی کرێی کرێکار داوە و کۆمەڵگای دابەشکردووە بۆ سێ چین کە بریتی لە چێنی ئازادەکانو چینی مسکینۆم و چینی کۆیلەکان.

**٤-یاسای لەبت عشتارو:**

مێژووی دەرچوونی ئەم یاسابیە دەگەڕێتەوە بۆ سالێ ١٨٨٥(پ،ز) کە پێشەکی و سی و یەك ماددەی لێی بەدەست گەیشتووە و لەسەر تابلۆی قوڕی ئاسایی دەرچووە.

**٥-یاسایی حمورابی:**

ئەم یاساییە لە ساڵی ١٦٩٤ (پ،ز) دەرچووە، ئەم یاساییە نایبترین داهێنانی مرۆڤی کۆنە و دەنگدانەوەی گەورەی هەبووە لای پیاوانی یاسا بە شیوەی گشتی و زانایانی مێژووی یاسا بە تایبەت.

**یاساکانی ڕۆژئاوای کۆن:**

گرنگی ئەم یاسایە لەوەدایە کە یونانییەکان یاسا کارییان بۆ کردووە و لەدوای ئەوان ڕۆمانییەکان یاساکارییان بۆ کردووە، یونانییەکان دوو یاسای گرنگیان داناوە ئەویش یاسای دراکۆن وسۆلۆن بوون .

١-یاسای دراکۆن لە سالێ (٦٢٠/پ،ز) بووە و یەکەم یاسای کۆنی یونانیەمەبەست لێی بە یاساکردنی دادکارییە یاساییە نەریتیەکان بووە کە ئاشنا بوون قۆرخ کرابوو لەلایەن چینی خانەدانەکانەوە و سنووریکی دانا بۆ دەسەڵاتی خانەدانەکان بە پێی ئەوەی بەرژەوەندییان دەخوازێت.

٢-یاسای سۆلۆن لەساڵی (٦٠٠/پ،ز) دەرچووە،ئامانج لە دانانی ئەم یاساییە بۆ ڕزگاربوون بوو لە شوێنەوارەکانی دەسەڵاتی باوکایەتی سنوورێك بۆ کەمکردنەوەی دابنێت ئەویش دان پێدان بووە بە مافەکانی تاك و پارێزگاریکردن بووە لێان بەرامبەر ئەو دادگاییەی دەوڵەت دروستی دەکات.

**یاسای رۆمانی**

رۆما دروستبوو شارێکی داخرابوو و پشتی دەبەست بە کشتوکاڵ کردن، دواتر گەشەی کردوو بۆۆ بە دەوڵەت و پاشان شاهەنشاهانە. بۆیە دەوڵەتی رۆمانی بەگۆرانکاری سیاسی گرنگدا تێپەربوو لەمیانەی گواستنەوەی ڕۆما لە شارەوە بۆ سیستەمی پاشایەتی دواتر سیستەمی شاهەنشاهانە و کۆمەڵگا لە کشتوکاڵیەوە گۆرا بۆ بازرگانی. یاسای ڕۆمانی کاریگەر کردووە سەر یاسایی بریتانیاو یاسای (Common Law)بووە، هەروەها کاریگەری یاسای گشتی کاریگەری هەبووە لە سەر چۆنیەتی داڕشتنی یاساکانی ئەمریکا، وەك هەمان کاریگەری یاسایی فرنسی بەسەر یاسای عرێاقۆ و میصری بەتەواوی ڕەنگی داوەتەوە..یاسایی رۆمانی بەسێ سەردەمی تایبەتدا گوزەری کردووە:

١-سەردەمی پاشایەتی.
٢-سەردەمی کۆماری-قونسولی.
٣-سەردەمی شاهەنشایەتی.

**یەكەم/سەردەمی پاشایەتی:**

مێژووی ئەم ڕۆڵە دەگەڕێتەوە بۆ دامەزراندنی ڕۆما لە پێش سێ سەدە و لە سالێ (٧٥٤/پ،ز) ساڵی (٥٠٩/پ،ز) لە ئەنجامی شۆڕشێك ڕوویداو تێدا پاشا دەركراو كۆماری ڕاگەیاند. بەڵام بە پێكهاتەی سیستەمی كۆمەڵایەتی كۆمەڵگای رۆمانی لە دووچین پێك دێت ئەوانیش چینی خانەدانەكان و چینی گشتی بوون.

**١-چینی خانەدانەكان:**

بریتی بوو لەسەرۆك خێڵ و ئەمانەش چینی باڵا پێك دەهێنن كە هەموو مافە شارستانی و سیاسی و ئابووریەكانیان بەتەواوی هەیە،هەروەها خاوەندارێتی زەوی لە ڕۆما و ئەوەی پاشكۆیەتی لەماف و پێگەی ئابوورییەكان تەنها بۆ ئەم چینە تایبەت كراوە.

**٢-چینی گشتی:**

بریتی بووە لە و چینەی كە پێگەیەكی كۆمەڵایتی و ئابووری لاوازی هەیە، مافەكانی كورتدەكرێنەوە لەسەر كرین و فرۆشتن لە چینی خانەدان، هەروەها حاڵەتی سیاسیی لە سەردەمی پاشایەتی لە یاسایی رۆمادا خۆی لە دامەزراوەی سیاسی دەبینیەوە كە ئەمانەن:

١-پاشا
٢-ئەنجومەنی پیران.
٣-ئەنجوومەنی میللیەكان.

**سەردەمی كۆماری**

ئەم سەردەمە دەست پێدەكات لەسەردەمی كۆمارییەوە لە ساڵی (٥٠٩/پ،ز) ئەم گۆرانكاریە دەستوور یە لە ئەنجامی شۆڕشێكی ئەرستۆكراتیەوە هاتە كایەوە لەلایەن خانەدانەكانەوە بۆ مانەوەی خۆیان لەدەسەڵات لە جیاتی پاشاكان، دەوڵەتی رۆما هێندە فراوان بوو كە هەموو ئیتالیای گرتەوە و فراوانبوونی لە حەوزی دەریای سپی ناوڕاست و ناكۆكی لە نێوران چینی خانەدانەكان و تێكەڵ بوونیان بە كەسانی تر بووە هۆی گەشە كردنی گۆرانی سیاسی و گۆرانكاری لەسەر چاوەكانی یاسا لە م سەردەمەدا. یاسایی رۆَمانی لە رووبەرێكی زۆری وولاتانی جیهانی گرتەوە بەتایبەتی لە وولاتانی ئەورویا و ئەمریكا، كە پشت ئەستوور بوون بە یاسایی رۆمانی بۆ دامەزراندانی یاسایە ك لە وولاتی خۆیاندا..

**سەردەمی شانشاهایەتی**

ئەم سەدەیە لە گرنتکترین سەدەکانی یاسایی رومانییە کە مێژووەکەی دەگەرێتەوە بۆ ساڵی (١٣٠/پ.ز) رووداو گەلێك وگەشەکردن و بەرەو پێشچوونی شارستانی تێدا سەریهەڵدا کەوایلێکرد بەسەردەی زانست ناوببرێت، سەدەی زانستی دەست پێدەکات بە فەرمانرەوایی شاهەنشا (ئوغستس اکتافیوس) لەساڵی (٢٧/پ.ز) و تا ساڵی (١٣٥/پ.ز) کۆتایی هێنان بوو بە بنەماڵەی سیفیر) سووری، بۆ یە شاهەنشا دەستی کرد بە دابەشکردنی دەسەڵاتەکانی بەم شێوەیە:

١-سەرپەرشتیاری گشتی.
٢-دەسەڵاتی ئاینییەکان.
٣-دەسەڵاتی فەرمانرەوایی ئامار.
٤-دەسەلاتی ئاینییەکان.
لە ساڵی (٢٣٥/پ.ز) ئەم چینە کۆتایی هات، ئەو ماوەیە بەلاوازی گشتی و ئەو هەرەسە جیادەکرێتەوە کە تووشی دەوڵەت بوو لەلایەن سیاسی و کۆمەڵایەتیەوە، هەروەها لەسەرچاوەکانی یاسایی رۆمانی بریتی بوو لە:

١-یاسا دانان.
٢-نەریت.
٣-الفقهە.
٤-یاسایی بریتۆری
سیستەمی یاسایی گۆرانکاری تێدا دەکرێت بە پێی پێشکەوتنی شارستانیەت، هەر هەردەوڵەتێك و سیستەمێکی یاسایی تایبەت بە خۆی هەیە، لێرەدا ئاماژەیەك بە سیستەمی دادگای وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکەم:

**سیستەمی دادگای فیدراڵی ئەمریکا:**
**سیستەمی دادگای باڵای ئەمریکا  دەتوانریت بکریت بە سێ بەشی سەرەکیەوە:**

**١-دادگای پێداچوونەوەی سەربازی:**

لەم دادگایە تەنها سەیری دۆسیەی هێزەکانی سەرباز و مارێنزو و لەشکری گەورەی سوپاو هێزەکانی ئاسمانی سەرجەم هێزە چەکدارەکانی ئەمریکا دەکریت ، کاتێك کێشەیەك دروست دەبێت لە نێو هێزەکانی ئەمریکا ئەم دادگایە مافی ئەوەی هەیە ئەو دۆسیە یەکلای بکاتەوە کەسەر بە دادگای باڵای

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە، واتە مافی پێداچوونەوەی هەیە بەو بریارانە سەبارەت بەم کێشانە دەدرێت لەبەردەم دادگا. لەم وێنەیەدا ئەوە پرۆفیسوور ڕاین لە زانکۆی سیراکس،ئەمریکا/ نیۆرك پرۆفیسسۆری سیستەمی یاسایی وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو و لەهەمان کاتدا ڕاوێژکار بوو لە کۆنگریسی ئەمریکا و دادگای فیدراڵی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا.

**٢-دادگای فیدراڵی چەند ناوچەیکی دیاریکراو:**

ئەم دادگایە سەر بە سیستەمی دادگای باڵای وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە، لەم دادگایەدا تەنها سەیری چەند دۆسێیەك دەکرێت وەك ( دۆسیسەی پێداچوونەوە جەنگاوەرانی کەم ئەندامانی جەنگ، یان کاتێك کیشەیەك دروست دەبێت لە نێوان بازرگانەکانەکانی ووڵات، یاخود دادگای بازرگانی نێودەوڵەتی)، واتە دادگای فیدراڵی ناوچەی مافی ئەوەی هەیە سەیری ئەم دۆسیانە بکات بۆ یەکلای کردنەوەی کێشەکانیان.

**٣-دادگای پێداچوونەوەی ناوچەی:**

بە پێی سیتەمی دادگای باڵای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەم دادگایە مافی ئەوەی هەیە دەست پێداچوونەوە بەو بڕیارانە بکات کە لەبەردەم دادگای باج و دادگای ناوچەی دەردەچێت. جگە لەمەش هەر وویلایەتێك دادگای باڵای تایبەت بە خۆی هەیە بۆ چارەسەر کردنی کێشەکان.

**سیستەمی دادگای ویلایەتی نیۆرك:**

دەتوانرێت بڵێن دادگای پێداچوونەوەی ویلایەتی نێورك: ئەگەر ئەم وویلایەتە وەربگرین وەك نموونەی سیستەمی دادگای ویلایەت تا ڕادەیك بۆمان روون دەبێتەوە لە چۆنیەتی سیستەمی دادگای ویلایەتەکان کە جیاوازترە لە سیستەمی دادگای فیدراڵی، لێرەدا دەکرێت بە دووبەشی سەرەکیەوە:

١ -پێداچوونەوەی دابەشکاری دادگای باڵا: ئەم دادگاییە مافی ئەوەی هەیە پێداچوونەوە بەو دۆسیانە دا بکات کە لەبەردەم ئەم دادگانەدا بریاری لەسەر دەدرێت:

أ-دادگای باڵا.

ب-دادگای باری کەسێتی.

ج-کاتێك دادگا بانگەشەی شتێك دەکات بۆ راست و دروستی.

د-دادگای پارێزگاکان و ناوچەی.

ه- دادگای بەرایی



**-سیستەمی دادگا لە ئەمریکا:**

ئەگەر دادگایی پێداچوونەوەی نیۆرك بە نمونە وەربگرین دەبینین جۆرێك لە ئاڵۆزی لە سیستەمی دادگایی وویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكادا هەیە، ئەگەر دوسیەیەكی شارستانی وەربگرین بەم شێوازە رێكارە یاساییەكان تەواو دەبێت تاكو قۆناغی كۆتایی:

یەكەمجار تبلیغ دەروات بۆ كەسێك كە داوا كراوە لەلایەن دادگاوە ، واتە ئەو كەسەی كە داوا دەكرێت لە لاین دادگاوە دەبێت ئامادە بێت چونكە سكاڵای لەسەر تۆمار كراوە، پاشان پێویستە داواكراو وەڵامی ئەو پسوولەی تبلیغی دادگا بداتەوە بە بوون و نەبوون واتە ئامادە دەبێت یان نا، دواتر پێش قۆناغی دادگایكردنەكە پێویستە بە ووردی گفتوگۆ بكرێت لەبارەی كێشەكەوە ئایا تاوانبارە یان بێتاوانە، لە دوای ئەو حاڵەتە قۆناغی گوێگرتنی پێش دادگایكردن دەست پێدەكات، واتە هێشتا قۆناغی مرافعە كردن دەستی پێنەكردووە.



پاش ئەوەی قۆناغی گوێگرتن تەواو دەبێت ئینجا قۆناغی دادگایکردنی تاوانبار یان کەسی تۆمەت بۆ هەڵواسراو دەست پێدەکات بەئامادەبوونی جێوری ,(Jury) واتە ژمارەیان بریتیە لە ١٢ کەس لەلایەن پارێزەران و دادگاوە هەڵدەبژێرین بۆ ئەوەی لەکاتی مرافعە ئامادە بن، ئەوانە کەسانی ئاسای کۆمەڵایەتین و لە دەرەوەی دادگا بانگهێشت دەکرێن و پاشان لەلایەن پارێزەرانی داواکارو داوا لەسەرکراو هەڵدەبژێرین بۆ ئەوەی یارمەتی دادوەر بدەن سەبارەت بەوەی ئایا ئەو کەسە تاوانبارە یان بێتاوانە. لە قۆناغی پێش کۆتایی دادەرو و جێۆری ,(Jury) کە ژمارەیان ١٢ کەس دەبێت بریار دەدەن سەبارەت بە کێشەکە، قۆناغی کۆتایی دادگاکە بریتی دەبێت لە قۆناغی پێداچوونەوە (الاستئناف) بە بریاری داگا.

**داواکاری گشتی:**

دادوەری دادگای باڵا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەلایەن سەرۆکی وولاتەوە دەست نیشان دەکرێت و پاشان دەنێریت بۆ کۆنگرێس بۆ ئەوەی ڕەزامەندی لەسەر دەرببڕن و گفتۆگۆی لەبارەیەوە بکەن و دواتر بۆ تصدیق کردن دەگەرێتەوە بۆ سەرۆکی وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. سەرۆکی دادگای باڵا لە ئەمریکا بۆ هەتا هەتایی لە پۆستەکەی دەمێنیتەوە تەنها بە مردنی ئەو کەسە گۆرانکاری دەکرێت و پۆستەکە دەدرێت بە کەسێکی تر. بەڵام داواکاری گشتی لە عیراق لەلایەن ئەنجومەنی دادوەرییەوە دەستنیشان دەکرێت و ئەمەش زۆر گونجاوە بە پێی دەستووریعیر َاق بەڵام لە هەرێمی

کوردستان سەر بە وەزارەتی دادە، واتە بە هیچ شێوەیەك پەرلەمان و سەرۆکایەتی هەرێم ڕۆڵیان لە دەستنیشانکردنی سەرۆکی داواکاری گشتی نیە لە هەرێمی کوردستان.

**شەریعەتە یاساییە پێشکەوتووەکان:**

کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بە درێژای مێژوو ئاشنا بوون بە زۆر یاسا و شەریعەت، هەندێك لەم یاسا و شەریعەتانە توانیوویانە بگەنە ڕەوڕەوی ژیانی مرۆڤایەتی ئەمەش بریتی بووە لە یاساکارییە یاساییە پێشکەوتووەکان. زانایانی مێژووی یاسا هەوڵیانداوە ڕیگرییەکانی گەشەکردن و هۆکارەکانی وەستانی لەئاستێکدا روون بکەنەوە،بۆیە وا پێشبینیکرا ئەو شەریعەتە یاساییانەی بۆ ماوەییەکی درێژ مابوونەوە لە ژێر کاریگەری داب و نەریتە نەنووسراوەکان کاریگەر بوو بە ئەفسانە یاخود بەچەمکەکانی ئاینە بتپەرستەکان لە دوای قۆناغی گواستنەوەی بۆ نووسین.

لەلایەکی ترەوە هۆکاری گەشە کردنی هەندێك شەریعەتی یاسایی و گەشە نەکردنی هەندێکی تر ڕەنگە ڕیگری گەشە کردن و هۆکارەکانی وەستانی بگەڕێتەوە بۆ ئەو بنەما ئاینیانەی کە گەلانی داب و نەریتە سەرەتاییەکانییان لێوەرگرتووە،پێشکەوتن لە تواناد‌ا نابێت تەنها لەوحاڵەتانەدا نەبێت کە هێزی یاسا دەگاتە ئاستی تەواو بۆ ملکەچکردنی نەتەوە بەتەواوەتی. لەگرنکترین ئەو شەریعەتە پێشکەوتووانەی کە ئێستا لە جیهاندا کاری پێدەکرێت سیانن کە ئەمانەن:

١-شەریعەتی ئیسلامی.

٢-شەریعەتی لاتینی.

٣-شەریعەتی ئەنگلۆسکسۆنی.

لەبەرئەوەی گۆڕانکای کۆمەڵایەتی وەك باوە دەکەوێتە پێش گۆڕانکاری دادکارییە یاساییەکان کە ڕێکییان دەخات، یاسا ئامانجی ڕێکخستنی ژیانی تاکەکانە لە نێو خۆیاندا یاخو گرنگی دانە بە ڕێکخستنی دروستبوونی پەیوەندی خێزان لەگەل یەکتردا یاخو بنیادنانی دروستبوونی پەیوەندی لە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگادا و پاراستنی سەرو ماڵیان لەلایەکی ترەوە،هەروەها بەرقەرارکردنی جۆرێکە لە جێگیری، بەڵام ژیانی کۆمەڵایەتی بەبەردەوامی لە گۆڕاندایە و دەبێت هەمیشە یاسا لە گۆرانکاری بێت، بە جۆرێك گونجاو بێت لەگەل ژیانی تاکەکانی کۆمەڵگادا.

ئەگەر بێت و گووزەرێك بکەیت بە نێو مێژووی دروستبوونی شاری کەلار و بەقەزا بوونیدا، دەبینیت چەندین بەرێوەبەرو فەرمانبەر لەم دەڤەرە خزمەتیان کردووە.. لێرەدا چەند چاوپێکەوتنیکم ئەنجامداوە لەگەل ،چەند کەسایەتیەك لەناوچەی گەرمیان، مەبەستم بوو بزانرێت یەکەم دامەزراندنی دادگایی کەلار بۆ ساڵی چەند دەگەرێتەوە ،لەو کاتەدا کێ دادوەر و فەرمانبەر بووە، لە چەند بەش پێکهاتووە. دامەزراندنی دادگای کەلار دیارە مێژوویەکی زۆر درێژخایانی نییە و دەگەرێتەوە بۆ ساڵی ١٩٧٢، کە

شوێنەکەی دەکەوێتە سەر جادەی جووت سایدی ناو شار ،لە تەنیشت بەرێوەبەرایەتی ئاگر کوژێنەوەی کەلار،بەرامبەر بنکەی پۆلسی ناوشار. سەرجەم پارێزەران لەم ژوورەدا دادەنیشتن، واتە ئەو جیگایە ژووری پارێزەرانی کەلار بوو.



یەکەم دادوەر کە لەم دادگاییە دەست بەکاربووە، بەرێز دادوەر (نیهاد الونداوی) بووە ،کە دانیشتووی قەزایی کفری بووە، هەفتەی یەك رۆژ دەوامی کردوە تەنها خۆی بووە ،وەك دادوەر رێکاری یاسایی ئەنجام داوە، ئەم دادوەرە خزمەتێکی باشی ئەو دادگاییەی کردووە ،سەرپەرشتی هەموو ئیش و کارەکانی ناو دادگایی لە ئەستۆبووە، بەڵام ئێستا لەژیاندا نەماوەو کوچی دوای کردووە. پاش کۆچی دوای ئەو دادوەرە، بەرێز دادوەر (عادل عبدالرەحمان) بوو ،وەك دادوەری دادگایی کەلار ئیش و کارەکانی دادگای بەرێوەبردوە، ئەم دادوەرە بۆ ماوەی شەش مانگ کاری کرد لە دادگایی کەلارو دواتر گواسترایەوە بۆ ناوچەیەکی تری سلێمانی،ئەم دادگاییە چەند بەشێکی هەبووە ئیش و کاری رۆژانەی خەڵکی بەرێوەدەبردوە، وەك بەشی: مارەبرین ، لەدایك بوون ، مردن ، لێکۆڵینەوە و جێبەجێکردن..

پاشان بەرێز دادوەر( سالار ئەحمەد عەبدول عەزیز) لەناوچەی زەنگاباد، گوندی تەپەقەوی لەدایك و بوو ،دادوەرێکی بەتواناو لێهاتوو بووە، لە ساڵی ١٩٧٩ بووە بە دادوەرو لە ساڵی ١٩٨٢ لە دادگای کەلار کاریکردووە...



لەهەمان ساڵدا بەڕێز (عمران یاوەر) دانیشتووی خانقین بوو، کە لەلایەن وەزیری العدلی ئەوکاتەی عیراقەوە دامەزراوە، وەك (محقق العدلی) و پاشان بە هۆی براکەیەوە(شەهید محەمەد یاوەر) کە لە ناو پێشمەرگە بوو گواستیانەوە بۆ سلێمانی.

دواتر بەڕێز داوەر( اکرم فرج امین)، ساڵی ١٩٨٤ لە دادگای کەلار وەك یاریدەدەری دادوەری کاریکردووە و ئیستاش وەك سەرۆکی دادگای تیاهەڵچوونەوەی ناوچەی کرکوك /گەرمیان کاری ئاسای ڕۆژانەی خۆی دەکات و بەردەوامە لە کارکردن.



لە ساڵی ٢٠٠٨ بەڕێز دادوەر (عبدالرزاق ئەحمەد عبداللە ..)وەك دادوەر دادکایی کەلار دەوامی ئاسایی خۆی کردوە،دانیشتووی شاری سلێمانی بوو...

بەڵام هەندێك لەو فەرمانبەرانەی لە ساڵانی ١٩٧٢ لەدادگایی کەلار دەوامی ئاساییان دەکرد، تاکو ئیستاش لەژیاندا ماون لەوانە نصرالدین حسن عارف، لەدایك بووی ١٩٥٥ دانیشتووی کەلارەوە و تەنها ئیش و کاری وولادەو زەواج و وەفاتی دەکرد. ئەم فەرمانبەر ئیستا لە دادگای جنائیی گەرمیان لەئیش و کاری ڕۆژانەی بەردەوامە ،وەك بەرێوەبەری بەریدی دادگا. یەکێکی تر لەو فەرمانبەرانەی کە کاریی ڕۆژانەی دادگایی بەرێوەدەبرد، لە ساڵانی ١٩٧٢ بەدواوە بەرێز (مکرم ..)بوو، لەدایك بووی ١٩٥٦وەك (مبلغ قزا)یی دەوامی دەکرد، ئێستا لە دادگایی کەلار وەك سەرۆکی پیشەوەرانی پێشکەوتوو دامەزراوە. لەو ژوورەدا دادوەرەکان کاری یاساییان ئەنجام دەداو دەوامی فەرمی خۆیان دەکرد..



بەرێز (حمید خورشید)یەکێکی تربوو، لەو فەرمانبەرانەی کە لە ساڵی ١٩٧٧ تاکو ساڵی ١٩٨٨ دەوامی دەکرد، وەك معاون قزائی خزمەتی کردووە لەدادگایی کەلار، تاکو ئیستاش لەژیاندا ماوە و بەئیش و کاری ڕۆژانەی خۆیەوە سەرقاڵە. هەروەها فەرمانبەر بەرێز (محمد حسن سەرحەد)، لە ساڵی ١٩٧٢ لەگەڵ دروستبوونی دادگایی کەلار دامەزراو و ئیش و کاری چاپکردنی بەرێوە دەبرد و ئیستاش خانەنشین بووە. دواتر بەرێز( ستار عزیز )وەك فەرمانبەری (کاتب العدل) لەسەرتاکانی ساڵی ١٩٨٠ دەوامی ئاسایی خۆی دەکرد و لەهەمان ساڵدا بەرێز (هیشام ...)، دانیشتووی ئاوایی گەورە/ قەڵا بوو ، مامۆستا بووە و وانەی کۆمەڵایەتی و کوردی دەوتەوە لە یەکێك لە خویندنگاکانی کەلار کە جیگاکەکی دەکەوێتە شوێنی هۆڵی هونەرمەندان، لە دادگایی کەلار وەك فەرمانبەر دەوامی دەکرد و ئیستاش لە ژیاندا نەماوە.

لەکۆتایدا تێگەیشتن لەبنەمایی یاسایی بەبێ توێژینەوە لەبنەرەتدا مێژوویەکی سەختە وکەسی یاسایی دەتوانێت لە مێژووی یاساو پێگەی ڕاستەقینەوە و بنەماو پرنسیپەکان و سیستەمە یاسا تازەکان هەست پێبکات لە قۆناغەکانی پەرەسەندنی شارستانیەتی مرۆڤایەتی. یاساکاری و سیستەمە

یاساییەکانی ئێستا تەنانەت شۆرشگێرەکانیش تەنها قۆناغێکن لە قۆناغەکانی پەرەسەندنی یاسایی کە بنیاد نراوە لەسەر ئەوانەی پێش خۆی ودەبێتە بنەمایەك بۆ قۆناغەکانی داهاتوو.

**گۆران حسێن ئەحمەد، لەدایك بووی ١٩٨٣لە گووندی بەردەسوور، خوێندنی سەرەتای و ناوەندی و دواناوەندیم لە ناحیەی ڕزگاری تەواو کرد، خوێندنی ئامادەی لە خوێندنگای شەهید ئارام تەواو کردووە لە ساڵی ٢٠٠٣-٢٠٠٤، بکالۆریوس لە یاسا لە زانکۆی سلێمانی لە نێوان ساڵانی ٢٠٠٣-٢٠٠٧، ماجستێر یاسای تاوان وکۆکردنەوەی بەڵگە لە شوێنی تاوان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، زانکۆی سیراکس لە نیۆرك،مامۆستایی زانکۆ بووە ئێستاش لەبەرێوەبەرایەتی یاسایی ئیدارەی گەرمیان دەوام دەکەم.**



- **لاوان ئەحمەد**

**گۆڤاری هێما دوایین گۆڤار کە لە شاری کەلار بڵاوبووەتەوە**

گۆڤاری هێما: گۆڤارێکی مانگانەی ئەهلی ئازادبووە، بەگوێرەی ئەو ژمارانەی لەبەردەست دان. ژمارە (١) لە یەکی ئۆکتۆبەری ٢٠١٥ بڵاوکراوەتەوە ، بەزمانی کوردی ، ئەگەر چی شوێنی دەرچوونی ڕۆژنامەکە شاری کەلاری ناوەندی ئیدارەی گەرمیان بووە، بەڵام گۆڤارەکە لەرێگای کۆمپانیایەکی بواری دابەشکردن و گەیاندنەوە لەسەرجەم کوردستان بڵاوکراوەتەوە. سنووری لۆکاڵی بوونی بڕیووەو لەسەر ئاستی هەرێمی کوردستان کاری کردووە، ئەمەش لەرۆژنامەو گۆڤار و بڵاوکراوەکانی تری سنوورەکە جیای دەکاتەوە.

لەسەر ڕووپەڕی گۆڤارەکە ناوی هەریەک لە (جەلال هۆرینی ) وەک خاوەن ئیمتیاز و (لاوان ئەحمەد) وەک سەرنووسەر هاتووە، گۆڤاری هێما کە ژمارەی لاپەڕەکانی (٤٠) لاپەڕە بووە، تەنها چوار ژمارەی لێ چاپکراوەو دواتر وەستاوە...

لە لاپەڕە یەکی ژمارە یەکدا لە سەر وتاری گۆڤارەکەدا بەناونیشانی (هێما لەخزمەتی ئازادی بیروڕا ) دا. هاتووە:"
**گۆڤاری «هێما» بە باوەڕبوون بە ئازادی بیروڕا وەک مافی تاک بۆ دەربڕینی ڕاوبۆچوونەکانی لە ڕێگای چاپەمەنیەکانەوە ، دەبێتە پانتایەک بۆ هەموو دیدە جیاوازەکان و بۆێرانە بیروڕاکان وەک خۆی بڵاودەکاتەوە**

**دوایین ژمارەشی لە واتا ژمارە (٤)لە ٢٠١٦/١/١٠ بڵاوکراوەتەوە**




کار و چالاکییەکانی
یەکەم فیستیڤاڵی (٤٦) ەمین ساڵەی بە قەزابوونی کەلار
١٩٧٠ - ٢٠١٦
بە دروشمی
"کەلار ناوەندی بووژانەوە
وگەشەکردنی گەرمیان"
بە چاودێری
بەڕێز (شەهاب ئەحمەد محی الدین)قایمقامی قەزای کەلار
یەکەم فیستیڤاڵی (٤٦) ەمین ساڵەی
بە قەزابوونی کەلار ڕێک دەخرێت
٢٠١٦/٢/٢٨
بە سپۆنسەری
کۆمپانیای حەسەن محەمەد مەجید
و هاوبەشەکەی


47
بە دروشمی:
پێکەوە بەرەو گەشەپێدانی
شاری کەلار
بە چاودێری قائیمقامی قەزای کەلار
بەڕێز شەهاب حاجی ئەحمەد
لیژنەی باڵای یادی کەلار
فێستیڤاڵی (٤٧)هەمین
ساڵیادی بە قەزابوونی کەلار
لە ڕۆژانی ٢٥ - ٢٠١٧/٢/٢٨
بەڕێوە دەبات.
بە سپۆنسەری کۆمپانیای ڕووناکی
ROONAKI

# چالاکییەکانی فێستیڤاڵی ٤٧ هەمین ساڵیادی بەقەزابوونی کەلار



- **دلێر عەبدولڕەحمان**

بەدروشمی (پێکەوە بەرەو گەشەپێدانی شاری کەلار)  و بەچاودێری شەهاب حاجی ئەحمەد، قایمقامی قەزای کەلار و ئامادەبوونی سەرپەرشتیاری ئیدارەی گەرمیان و بەڕێوەبەری ژمارەیەك لە بەڕێوەبەرایەتی و فەرمانگە و دامودەزگا حکومییەکانی گەرمیان و کەلار و ڕۆژنامەنووسان و ڕۆشنبیران، لیژنەی باڵای یادی کەلار فێستیڤاڵی ٤٧ هەمین ساڵیادی بەقەزابوونی کەلاری ئەنجامدا.

ڕۆژی یەکەمی فێستیڤاڵ لە ٢٠١٧/٢/٢٥ لە دیوانی قایمقامیەتی قەزای کەلار، بەئامادەبوونی ژمارەیەك لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن، بەرنامەی کاروچالاکییەکانی دووەمین فێستیڤاڵی ٤٧ هەمین ساڵیادی بەقەزابوونی کەلار خرایەڕوو، ئێوارەی هەمان ڕۆژ پێشانگایەکی شێوەکاری بۆ هونەرمەند عەلی تازەدێی لە ناو بازاڕی شاری کەلاردا بەناوی (ئاشتی) کرایەوە.

ڕۆژی دووەمی فێستیڤاڵ لە ٢٠١٧/٢/٢٦، لەنێو بینای زانکۆی گەرمیان، پێشانگایەکی فۆتۆگرافی بەناوی (کۆنویێ) بۆ هونەرمەندان دیار ڕەشید و نیعمەت مەلۆ کرایەوە و دواتریش لەنێو هۆڵی سیمیناری کۆلێژی پەروەردەی زانکۆی گەرمیان، کۆڕێك بۆ هەردوو نووسەر و کەسایەتی شاری کەلار شێخ محەممەد شاکەلی بەناونیشانی (کەلار و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەی کورد) و ئەندازیار خوسرەو جاف بەناونیشانی (من و کورتەیەك لەمێژووی تەلارسازی) بەڕێوەچوو، ئێوارەی هەمان ڕۆژ لە تەنیشت کتێبخانەی گشتی کەلار پەردە لەسەر پەیکەری (کۆڵبەر) ی ئەندازیار خوسرەو جاف لادرا.

ڕۆژی سێیەمی فێستیڤاڵ لە ٢٠١٧/٢/٢٦، لە هۆڵی سیمیناری کۆلێژی پەروەردەی زانکۆی گەرمیان، کۆڕێك بۆ بێستون ژاڵەیی بەناونیشانی (کۆمەڵی مەدەنی لە کەلار) و مامۆستا سەباح عەلی جاف بەناونیشانی (ڕەوتی

ڕۆژنامەگەری لە کەلاردا) و مامۆستا مقداد شاکەلی بەناونیشانی (جوگرافیای شاری کەلار) بەڕێوەچوو، ئێوارەی هەمان ڕۆژ لە باخچەی بەردەم قوتابخانەی لەیلا قاسم پێشانگایەکی شێوەکاری بۆ هونەرمەند دکتۆر بەیان مانی کرایەوە.

ڕۆژی چوارەمی فێستیڤاڵ لە ٢٠١٨/٢/٢٨، بە ئامادەبوونی قوباد تاڵەبانی جێگری سەرۆکی حکوومەتی هەرێمی کوردستان و نەورۆز مەولود محەمەد ئەمین وەزیری شارەوانی و گەشتوگوزار و دەرباز عەبدوڵا ڕەسول وەزیری وەزیری ئاوەدانکردنەوە و نیشتەجێکردن و مەولود باوەمراد وەزیری گواستنەوە و گەیاندن و سەلاح کوێخا سەرپەرشتیاری ئیدارەی گەرمیان و شەهاب حاجی ئەحمەد و ژمارەیەك لە بەڕێوەبەری گشتی و بەڕێوەبەری دامودەزگاکانی سنوورەکە، لە کۆتا ڕۆژی فێستیڤاڵدا لە هۆڵی بەڕێوەبەرایەتی وەرزش و لاوانی گەرمیان پێشانگایەکی فۆتۆگرافی بۆ وێنەگری شاری کەلار فەیزی ئیعتیماد و پێشانگایەکی شێوەکاری بۆ مامۆستا فریاد حسێن کرایەوە، دواتریش وتاری لیژنەی باڵای ئامادەکاری فێستیڤاڵ و قایمقامی کەلار و جێگری سەرۆکی حکوومەت خوێندرانەوە و لەلایەن هونەرمەند ئارام ڕەحیم گۆرانی (کەلار) پێشکەش کرا و دواتریش هونەرمەند شکور خەیات چەند گۆرانییەکی پێشکەش کرد و دۆکیۆمێنتارییەك لەسەر شاری کەلار نیشاندرا، هەمان ڕۆژ یارییەکی دۆستانە لەنێوان گرووپی میدیای بینراو و تیپی یەکە ئیدارییەکان بەڕێوەچوو، شەوی هەمان ڕۆژیش لە هۆڵی فۆلکلۆری ساڵەحی کەلەپور شەوچەرەیەك ئەنجامدرا.

فێستیڤاڵی ساڵیادی بەقەزابوونی کەلار، ماوەی سێ ساڵە لەسەریەك بەسەرپەرشتی قایمقامیەتی قەزای کەلار و بەهاوکاری ژمارەیەك ڕۆشنبیر و ڕۆژنامەنووس و کەسایەتی و مامۆستا و دکتۆر و چالاکوانی مەدەنی، لە شاری کەلار ئەنجامدەدرێت.

یەکەمین فێستیڤاڵی ساڵیادی بەقەزابوونی کەلار بەسپۆنسەری کۆمپانیای حەسەن محەمەد مەجید و هاوبەشەکەی و دووەمین فێستیڤاڵیش بە سپۆنسەری کۆمپانیای ڕووناکی ئەنجامدراون، بۆ ئەمساڵیش ئیدارەی گەرمیان تێچووی سێیەمین فێستیڤاڵی ساڵیادی بەقەزابوونی کەلاری گرتووەتە ئەستۆ.

ژمارە (٢)ی شوباتی ٢٠١٨

# فۆتۆ ستۆری یادی ٤٧ ساڵەی بە قەزابوونی کەلار

فۆتۆ : دلێر عەبدول ڕەحمان







# بیرۆکەی یادی بەقەزابوونی کەلار



- **شەهاب حاجی ئەحمەد / قایمقامی قەزای کەلار**

دوای دەست بەکاربوونم وەکو ٢١مین قایمقامی قەزای کەلار لە میانەی ئەوسەردانە کۆمەڵایەتییانەی دەمکرد بۆلای کەسایەتی و دۆست و هاوڕێیان و خەڵکی شار، لەشەوی ٢٠١٥/٥/٤ لەگەڵا هاوڕێم NRTمەریوانی حاجی حەسەن کە ئەوکات پەیامنێری کەناڵی ئاسمانی

بوو سەردانی نووسەر و وەرگێڕ مامۆستا مستەفا سەعید عەلی مان کرد ، لەمیانەی قسەو گفتوگۆکاندا مامۆستا مستەفا کۆمەڵێك وێنە و دیکۆمێنتی کۆنی شاری کەلاری پیشاندایین لەنێویاندا وێنەی زۆرێك لە قایمقامەکان ، و ئەو مەرسومە کۆمارییەی کە کەلاری پێکراوەتە قەزا لە ١٩٧٠/٢/٢٨ ، بۆیەبیرۆکەی ئەوەمان لادروست بو بۆی ئەورۆژەنەکرێتە یادی بەقەزابوونی کەلار و ساڵانە وەك یادێك لەو ڕۆژەدا یادبکرێتەوە، بۆیە هەرسێکمان لەسەر ئەوە ڕێککەوتین کەبیرۆکەکە بیرۆکەیەکی باشەو هەوڵبدرێت کاری لەسەر بکرێت ئەوە بوو بۆ ئەو مەبەستە پەیوەندیمان کرد بە چەند هاوڕێیەکەوە و پێشنیازەکەمان لەگەڵیان باسکرد ئەوانیش زۆریان پێخۆش بوو کەیادێکی لەو جۆرە ساڵانە بکرێتەوە. ساڵی یەکەم یادی ٤٦ ساڵە بوو. بەبێ دەرکردنی هیچ بڵاوکراوەیەك لە ڕۆژی ٢٠١٦/٢/٢٨ لەژێر دروشمی کەلار ناوەندی

بووژانەو و گەشەکردن بەسپۆنسەری کۆمپانیایی شێخ حەسەن محەمەد مەجید لە هۆڵی وەرزش و لاوان ی کەلار کردەوە بە کۆمەڵێك چالاکی جۆراو جۆر لەوانە

پێشانگای فۆتۆگرافی، و ووتارو چەندین چالاکی هونەری گۆرانی و وەرزشی، ئەم هەڤاڵانەش ئەندامی لیژنەی باڵای ئامان کاربوون:

١ـ شەهاب حاجی ئەحمەد

٢ـ ساڵەح هەلاج

٣ـ رامیار عەبدولڕەحمان ئەحمەد

٤ـ مامۆستا مستەفا سەعید عەلی

٥ـ بێستون ژاڵەیی

٦ـ مامۆستا دیار رەشید کەریم

٧ـ ستار عەزیز مەجید

٨ـ مەریوان حاجی حسن

٩ـ مامۆستا ئەحمەد محەمەد قادر

هەروەها ساڵیادی٤٧ ساڵەی بەقەزا بوونی کەلار لە ٢٠١٧/٢/٢٥ دەستپێکرد بەچەندین چالاکی جۆراو جۆر و چەند رۆژێکی خایاند و بە درووشمی ( پێکەوە بەرەو گەشە پێدانی شاری کەلار ) لە هۆڵی وەرزشی لاوانی کەلار (بەسپۆنسەری کۆمپانیایی روناکی) چالاکیەکانی ئەنجامدا. رۆژی ٢٨ / ٢ کە رۆژی بەقەزابوونی کەلارە، بەڕێز قوباد تاڵەبانی جێگری سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان لەگەڵ بەڕێز سەلاح کوێخا سەرپەرشتیاری ئیدارەی گەرمیان ئامادەی تەواوی چالاکییەکان بوون و تا دوا چرکەکانی چالاکییەکان لە هۆڵەکەدا مانەوە. لیژنەی ئامادەکار ئەم بەڕێزانە بوون:

١ـ شەهاب حاجی ئەحمەد

٢ـ د. دارا حەمید محەمەد

٣ـ سالەح هەلاج

٤ـ مامۆستا مستەفا سەعید عەلی

٥ـ مامۆستا ئەحمەد محەمەد قادر

٦ـ مەریوان حاجی حسن

٧ـ پشکۆ محەمەد رۆستم

٨ـ مامۆستا دیار رەشید کەریم

٩ـ مامۆستا دلێر عەبدولرەحمان

١٠ـ بیستۆن ژاڵەیی





رۆخانی بەشی سەرەوەی "قەڵای شێروانە" بەهۆی بومەلەرزەوە    ( فۆتۆ : دلێر عەبدولڕەحمان)